# وتاری فیکری و سیاسی

- کۆنگرەی چوارەمی کۆمەڵی دادگەری
- کۆنفرانسی ڕۆژنامەوانی




عەلی باپیر




١٤٤٢ - ك        ٢٠٢١ - ز

# وتاری فیکریی و سیاسیی

- کۆنگرەی چوارەمی کۆمەڵی دادگەری
- کۆنفرانسی ڕۆژنامەوانی



١٤٤٢-ک ٢٠٢١-ز

# پێشکەش بێ

بەهەمــــوو ئەوانــــەی بەعەقڵــــی کــــراوەو دڵی فــــراوان و ڕەوشــــت و ئاکاری بەرزەوەو، لەســــەر بناغەی قورئانی بەپێزو، بەڕێبــــازی پێغەمبــــەری بەڕێــــزدا، کاردەکــــەن و هەوڵدەدەن، بۆ پاکســــازیی و چاکســــازیی تێداکردنی کۆمەڵگاو قەوارەی سیاسییان.

# پێشەکیی

## الحمدلله وحده، والصلاة والسلام على من لانبيَّ بعده

خوێنەری بەڕێز!

ئەم بەرهەمەی بەردەستت بریتیە لە:

وتــاری سیاســیی کۆنگــرەی چوارەمــی کۆمەڵی ئیســلامیی لــەڕۆژی: (٢٠٢١/٢/١٨)زدا بەرانبــەر: (٥/صفر/١٤٤٢)کــ دا، کــە لەحەوت تــەوەر پێکهاتــوەو، هەوڵمــداوە هێڵەگشــتیی و ســەرەکییەکان و، بازنەو جوغزی فراوانــی کاروپڕۆژەی: (کۆمەڵ) ی لــەم قۆناغــەدا تێــدا بخەمەڕوو.

کۆنگــرەی ڕۆژنامەوانیــی کــە لــەڕۆژی: (٢٠٢١/٢/٢٧)زدا بەرانبــەر: (٢٠٢١/٥/١٤)ک، لــە هەولێر بۆ ســەرجەم کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بەســتراو، وەڵامی پرســیارەکانی ســێزدە (١٣) کەناڵی تێــدا درایەوە، کە دەوری ســی (٣٠) پرســیار بوون.

هیواداریشــم هەم وتارەکــەی کۆنگــرە، کە وتارێکــی ئیمانیی و فیکریی و سیاســییە و، هــەم کۆنگــرە ڕۆژنامەوانییەکەش، مایەی بەرچاوڕوونیــی و ڕێڕۆشــنیی بن، بۆ هەرکەســێك بیەوێ باشــتر بە کۆمەڵــی دادگەریی ئاشــنابێ و زیاتری بناســێ.

والسلام علينا وعلى عباد الله الصالحين.

هەولێر

١٤٤٢/٦/٨ك * ٢٠٢١/٣/١٩ز

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إنَّ الْحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيِئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَن يَهْدِه اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَه إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾ آل عمران.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾ النساء.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾ الأحزاب.

**أَمَّا بَعْدُ:**

فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيثِ كَلاَمُ الله، وَخَيْرَ الْهَدِي هَدْيُ مُحَمَّد صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّار.

بەڕێـزان! برایـان و خوشـکان، ئەندامـانی کۆنگـرەی چوارەمـی کۆمەڵـی ئیسـلامیی!

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

بەڕێـزان! ئێمـە ئـەم کۆنگـرەی چوارەمـە لـە کاتێکـی یەکجـار ناسـک و دژواردا، کـە هەرێمـی کوردسـتان و عێـراق و ناوچەکـەش پێیـدا تێدەپـەڕن، دەبەسـتین، ئـەم کۆنگـرەی چوارەمـە، نیزیکـەی سـاڵێك لـە وادەی خـۆی دوا کەوتـە بـە هـۆی تەشەنەسـەندنی پەتـای کۆڕۆنـاوە، هیـوادارم ئـەم کۆنگـرەی چوارەمـە وێسـتگەیەکی گرنـگ بـێ بـۆ چـاو بەخـۆدا گێڕانـەوە لـە ڕابـردوودا، ڕوانیـن بـەرەو داهاتـوو، لـە ڕابـردوودا هـەر کـەم و کووڕیـی و کـرچ و کاڵییەکـمان بـووە، بتوانیـن چارەسـەری بکەیـن خـوا پشـتیوانبێ و، هـەر چاکەیەکـمان بـووە بتوانیـن زیاتـر بیچەسـپێنین و، گەشـەی پـێ بدەیـن، بـۆ داهاتـووش، دوورو فـراوان بڕوانیـن، فراوانـتر لـەوەی کـە هەیـن و باشـتر کار بکەیـن، باشـتر لـەوەی کـە تاکـو ئێسـتا کردوومانـە.

## بـەڕێـزان!

بەرلەوەی بچمە سـەر دەقـی وتارکەم بە پێویسـتی دەزانـم پڕ بە دڵ سـوپاس و پێزانین پێشـکەشی هەمـوو لایەکتان بکـەم، چ ئەو بەڕێزانەی ئێسـتا ئامادەن، چ خوشـک و برایانی دیکەتـان لە هەموو گۆشـەو کەنارەکەنـانی هەرێمـی کوردسـتان و دەرەوەی هەرێمی کوردسـتان و هەندەرانیش، بەڕاسـتی هیممەت و خۆڕاگریی و پشوو درێژیی ئێـوە بوو، دڵسـۆزیی و لێبـڕانی ئێوە بوو کـە توانی کارو

کاروانی کۆمەڵی ئیسـلامیی لـەو هەموو تەنگژانـە دەرباز بکات و، بـەم قۆناغ و هەوارەی ئێسـتای بگەیەنـێ، خوا پاداشـتتان بداتەوە، سـەبرو پشـوو درێژیـی و خۆڕاگریـی و نەپسـان و، تەحەممول و دنیـا بەکەم گرتنتـان، دڵنیابـن لە تـەرازووی چاکەکانتـان دایەو، پارسـەنگێکی قورسـەو، خوا پشتیوان بێ مایەی سـەربەرزییتانە بۆ دنیـاو قیامەت.

ئەم کۆنگرەیە لە کاتێکدا دەبەستین، کە خەڵکێکی زۆر لە هەرێمی کوردستاندا، چ خەڵکێک کە لە کایەی سیاسییدا کاری کردوە، چ خەڵک بە گشتیی چاوەڕوانیی و ئومێدێکی خێری زۆریان بە ئێمە هەیە، بۆیە پێویستە هەوڵ بدەین، ئەم کۆنگرەیەمان بە شێوەیەک گرێ بدەین و بریاری وای تێدا بدەین، کە لە ئاستی ئومێدی خێرو چاوەڕوانیی ئەو خەڵک و میللەتەماندابن، هەروەها ئێمە خۆمان بە شوێنکەوتووی پەیامی خوا دەزانین و، خۆمان بە شوێنکەوتووانی پێغەمبەری خوا دەزانین (ﷺ) خواش پەیامەکەی خۆی بۆ هەموو مرۆڤایەتیی ناردوە: ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ١٠٤﴾یوسف. هەروەها پێغەمبەرەکەی خۆیشی بە ڕەحمەت و بەزەیی ناردوە بۆ هەموو جیهانییان، وەك فەرموویەتی:﴿وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ١٠٧﴾ الأنبیاء. بۆیە دەبێ هەوڵ بدەین لە ئاستی بەرزی پەیامی خوادابین و، لە ئاستی بەرزی پێغەمبەری خوادا بین (ﷺ).

## وتارەکەشم لە حەوت تەوەردا پێشکەشی ئێوەی بەڕێز دەکەم

# تـــەوەری یـــەکـــەم

## لە ڕووی بناغە بوونی وەحیی و پەیامی خواوە، بۆ سەرجەم کارو جموجۆڵ و چالاکییەکانمان

ئێمــە دەبــێ هەمیشــە ئاگامــان لــەو خاڵــە بــێ، کــە وەحیــی خــوای پەروەردگارمــان بــەبناغــە گرتــوە، بــۆ کــۆی جموجــۆڵ و چالاکییەکانمــان.

خــوا «سبحانه وتعـالی» لــە ئادەمــەوە تاکــو خاتــەم (صەڵات و سـەلامی خــوا لەســەر هەمــوو پێغەمبــەران بــێ) هەموویــانی بــە هیدایــەت و ڕێنمایــی خۆیــەوە نــاردوون، بــە ئاییــن و بەرنامــەی حەقــەوە نــاردوونی، تاکــو ڕێپیشــاندەری مرۆڤایەتیــی بــن، تاکــو بــە مرۆڤــەکان بڵێــن: چۆن بژیــن، خــوا لێیــان ڕازی دەبــێ؟ خــوا مرۆڤــەکانی وێــڵ نەکــردوون لەســەر زەویــی حەواڵــەی خۆیانیــان بــکات، بەڵکــو بــۆ خــۆی مشــووری لــێ خــواردوون لــە ڕێــی پێغەمبەرانیــەوە (عليهم الصلاة والسلام).

ئنجائایــا ئایینــی خــوا کــە لــە قورئــان و ســوننەتدا بەرجەســتەیە، لــە فەرمایشــتی خــوا و لــە ڕێبــازی پێغەمبــەری خــوادا (ﷺ) ، چیمــان پــێ دەڵــێ؟

بەرنامـــەی خـــواو وحیـــی خـــوا، زانیارییەکـــی بـــێ خڵتەمـــان دەخاتە دەســـت، لەبارەی بووناســـییەوە کـــە ئەم گەردوونـــە چییە؟ ئێمە کێیـــن؟ بۆچـــی هاتووین؟ ئـــەم گەردوونـــە لە کوێـــوە هاتوە؟ ســـەرەنجامی چـــۆن دەبێـــت؟ ژیـــانی دونیـــا چیـــە؟ دوا ڕۆژ چۆنە؟ پێویســـتە چۆن بژین؟ حـــەڵاڵ و حەڕام چـــی و چین؟ چاکـــەو خراپە چیـــن؟ لەهەمـــوو ڕووێکـــەوە ئێمـــە بـــە فەزڵـــی وەحیـــی خواوە

خۆمـــان لەبەر ڕۆشـــنایيدا دەبينيـــن، وەک خـــوا دەفەرمویٚ: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِي مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِۦ مَن نَّشَآءُ... ﴿٥٢﴾﴾ الشورى.

واتـە: ئێمـە وەک چـۆن پێغەمبـەرانی پێشـو سروشـیان بـۆ کـردوون، وەحییـیان بـۆ نـاردوون، بـۆ تـۆش بـە هەمـان شـێوە ئـەی پێغەمبـەری کۆتایـی! (موحەممـەد ﷺ)، ڕووحێکـیان بـۆ تـۆ نـاردوەو گێڕاومانـە بـە ڕۆشـنایی، هەرکەسـێک کـە بمانـەوێ پێـی ڕاسـتە ڕێ دەکەیـن.

بەڵـێ بناغـەی بـوونی ئێمـە وەک خەڵکێکـی شـوێنکەوتووی هیدایەتی خـوا، ئەوەیـە کـە ئێمـە لـە وەحییـەوە سـەرچاوە دەگریـن، بوونناسـیی و ئیـیان و عەقیـدەو، حـەڵاڵ و حـەڕام و، ڕەوشـت و ئـاکارو، هەڵوێسـتی سیاسـیی و کۆمەڵایەتیـی و، تێڕوانیـن و بیـرو بۆچوونەکانمـان، لـە وەحییـەوە وەردەگریـن.

وەحیـی خـوای پـەروەردگار چـوار چێوەمـان بـۆ دادەنێـت، بەتایبـەت لـەو بوارانـەدا کـە گـۆڕاو، (متغیـرات)ن، چـوار چێوەیەکـی فراوانمـان بـۆ دادەنـێ، هێڵـە گشـتییەکانمان بـۆ دیاریـی دەکات، بـەڵام دەبـێ بـە عەقـڵ و سـەلیقەو ئیجتیهـادی خۆمـان و لـە بـەر ڕۆشـنایی ئـەو هێڵـە گشـتییانەدا، لـەو چـوار چێـوە فراوانـەدا، ئـەو بۆشـاییە پڕبکەینـەوە، بۆیـە زانایـان وەک بنچینەیـەک دایاننـاوە دەڵێـن: (تفصیـل في الثوابـت، إجـمال في المتغـيرات)، شـەریعەتی خـوا بـە درێژیـی لەبـارەی نەگۆڕاوەکانـەوە قسـەی کـردوە، لەبـارەی ئیـمان و عەقیـدەوە نوختـەی خسـتۆتە سـەر پیـت، لـە بـارەی پەرستشـەکانەوە، لە بـاری کەسـێتییدا، لـە بـواری حـەڵاڵ و حەڕامەکانـدا، لـە بـواری ڕەوشـت و ئاکارەکانـدا،

نوختــەی خســتۆتە ســەر پیــت، بــەڵام لەبــواری حوکــم و سیاســەتدا، لــە ڕووی کۆمەڵایەتییــەوە، لــە ڕووی جەنــگ و ئاشــتییەوە، لــە ڕووی پێکــەوە هەڵــس وکەوتکــردنی پێکهاتــەکانی کۆمەڵــگاوە، شــەریعەت بــە دانــانی چەنــد هێڵێکــی گشــتیی و چوارچێوەکــی فــراوان، ئیکتیفــای کــردوە، چونکــە خــوای کاربەجــێ دەزانــێ کــە بەشــەر لــە ڕووی ماددیــی و هەڵســوکەوتی دنیاییــەوە، زۆر گەشــە دەکات و بــەرەو پێــش دەچێــت، بۆیــە شــەریعەت دەقــی کەمــی دانــاون، تاکــو دەســت و پێــمان نەبەســتێ، عەقڵــمان ئازادبــێ، بــۆ ئیجتیهــادو کۆششــکردن و پڕکردنــەوەی ئــەو بۆشــاییانەی کــە خــوای کاربەجــێ بەجێــی هێشــتوون، بــۆ گــۆڕانی زەمــان و پەرەســەندنی کۆمەڵــگاکان.

ئنجا ئێمــە بــە فەزڵــی ئــەوە کــە لەبــەر ڕۆشــنایی وەحییــدا کارو چالاکییــەکانی خۆمــان دەکەیــن، بــراو خوشــکە بەڕێزەکانــم! لــە ڕووی سیاســییەوە دامــەزراوو ســەقامگیربووین و، هــەر ڕۆژە ڕوومــان لــە لایــەک نەکــردوە، هەروەهــا بە هاوســەنگیی مامەڵەمــان کــردوەو، خۆمان پاراســتوە لــە تێپەڕاندن و کــورت هێنان، لە ڕووی سیاســییەوە، هەمیشــە هەوڵمانــداوە لــە ســەنگەری بەشــخوراواندابین، ئــەو ســەنگەرەی کــە هەمــوو پێغەمبــەرانی خــوا (عليهم السلام) تێیــدا بــوون، هەروەهــا لەبەرانبــەر ســتەمکاران و خــۆ ســەپێنەران و خــۆ بــەزل گــران و خۆشــگوزەرانەکاندا بوەســتین، ئەوانــەی کــە هەمــوو پێغەمبــەران (عليهم السلام) دژایەتییــان کردوون، تەماشــای هەمــوو قورئــان بکــەن، تەماشــای بەســەرهاتی پێغەمبــەران بکــەن (عليهم السلام) لــە نووحــەوە هەتا پێغەمبــەری کۆتایی، کێ شــوێنکەوتووی پێغەمبــەران بــووە؟!، ڕەش و ڕووت و چەوســێندراوەکان، مــاف خــوراو

و مـاف پێشـێل کـراوەکان (المسـتضعفون) ئـەدی کـێ دژی پێغەمبـەران بـووە؟!، خـۆ سـەپێنان، خۆشـگوزەرانان، تاوانبـاران و زێدەڕۆییـکاران!، (مسـتکبرین، مترفیـن، مسرفیـن، مجرمیـن)، ئێمـەش لـە ئەنجامـی ئەوەدا کـە خـوا تەوفیقـی داویـن لەبـەر ڕۆشـنایی وەحییـدا سیاسـەت بکەیـن، هەوڵمانـداوە وەک پێغەمبـەران بکەیـن، هەوڵمانـداوە لـەو سـەنگەرەدابین کـە پێغەمبـەران تێیـدا بـوون و، هەوڵمانـداوە دەسـتی ئەوانـە بگریـن و پێـشی ئەوانـە بگریـن کـە پێغەمبـەران لەبەردەمیانـدا وەسـتاون و لـە پێشـیاندا وەسـتاون، دوژمنـی سەرسـەختی پێغەمبـەران بـوون (ﷺ)، واتە:خۆسـەپێنان و سـتەمکاران.

هەروەهـا ئێمە بە هۆی شـوێنکەوتنی پێغەمبەرانـەوە (ﷺ) فێربووین کە کاری سیاسـیی بکەین بەڕەوشـت بەرزیی و سـەر ڕاسـتیی و دڵسـۆزیی و بـە بەزەیـی و پەرۆشـەوە لەگـەڵ هەمـوو کەسدا، بـا کینـەو بوغـزی مێژوویـی نەمانجووڵێنـێ و لە مێـژوودا نەژین، چاومان لـە تۆڵەکردنەوەو داخـی دڵـی خـۆ پـێ ڕشـتن نەبـێ بـە هیـچ کـەس، بەڵکـو بـە بەزەیـی و پـەرۆش و ڕاسـتیی و دڵسـۆزیی، لەگەڵ هەمـوو لایەکدا مامەڵە بکەین، وەك پێغەمبـەران فەرموویانە:﴿وَأَنَا۠ لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴿٦٨﴾﴾ الأعراف.

هەروەهـا لـە بـواری کۆمەڵایەتییـدا، وەحیـی خـوا فێـری کردوویـن کـە مرۆڤـەکان هەمـوو وەک یەکـن، مرۆڤـەکان هەموویـان لـە دایـک و بابێکـن: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾﴾الحجرات.

خوا لەسەرووی حەوت ئاسمانەوە بانگی مرۆڤایەتیی دەکات، ئەی خەڵکینە! ئێوەمان لە نێرو مێیەک، ( دایک و باپێک )خوڵقاندوە، گێڕاومانن بە چەند گەل و تیرەیەک، تاکو پێک ئاشنابن، پێکەوە هاوکاربن، بەڕێزترتان لە لای خوا پارێزکارترتانە، خوا زانای شارەزایە.

کەواتە: کەس بۆی نیە هیچ ئیددیعایەک بەسەر کەسی دیکەدا بکات، هیچ کەس بۆی نیە کەڵکەڵەی ئەوەی لە کەللەدا بێ، خەڵک خزمەتکارو کۆیلەی بێ، ئەویش سەر دەستیانبێ و ئەوان بن دەست بن .

هەروەها وەحیی خوا فێری کردووین کە ئێمە نەتەوەکەی خۆشمان لە ئاستی نەتەوەکانی دیکەی دنیادا ببینین، چونکە خوا دەفەرموێ:﴿وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْ ﴿١٣﴾﴾**الحجرات.** چەندە عەرەب و تورک و فارس نەتەوەن، وەک سێ گەلی دراوسێمان، کوردیش بەقەدەر ئەوان نەتەوەیەو، خاک و خەڵک و زمان و مێژوو و کلتووری خۆی هەیە، هیچ جیاوزایی نیە لەگەڵ ئەواندا و، هەموو ئەو مافانەی ئەوان هەیانن، شەریعەت فێری کردووین، بزانین نەتەوەکەی ئێمەش ئەو مافانەی هەن، ئەگەر ئێستا لێی بەهرەمەند نیە، ئەوە لێی زەوت کراوەو دەستی لێ بەسەردا گیراوە.

# تەوەری دووەم

# لە ڕووی نیشتمانیی و نەتەوەییەوە

هەرچی کە دەیڵێم هەوڵ دەدەم سەرنجێک لە واقیعی ئێستامان بدەم، دواییش تەماشایەکی داهاتوو بکەم، داخۆ چیبکەین؟

نیشتیمان، ئەو زەوییەیە کە نەتەوەیەک لەسەری دەژین، کۆمەڵە خەڵکێک لەسەری دەژین.

نەتەوەش ئەو کۆمەڵە خەڵکەن کە ئەگەر زوڵمیان لێ نەکرابێ، دەبێ لە خاکەکەی خۆیاندا سەربەست و ئازاد بژین، هەموو ئەوانەی کە لە بیری نەتەوایەتیی دەکۆڵنەوە وایانگوتووە، هەموو نەتەوەیەک بۆی هەیەو مافی هەیە، لەسەر زەمینی خۆیدا ئازادو سەربەست بژی و، کەس نەیکاتە هاووڵاتیی پلە دوو و سێ، کەس نەیچەوسێنێتەوەو مافی ئابووریی لێ زەوت بکات، و خێرو بێری بە تاڵان بەرێ و، مافی سیاسیی لێ زەوت بکات و، لەجیاتی ئەو بڕیاربدات و، مافی ئایینی لێ زەوت بکات و، مافی کلتووریی لێ زەوت بکات و، دەبێ هیچکەس هیچ مافێکی لێ زەوت نەکات، ئەوە مانای نەتەوەیە.

ئایا ئێمە ئێستا واقیعی نیشتمانیی و نەتەوەیی خۆمان چۆن دەبینین؟ هەموو لایەک ئاگادارن، ئێمە ئێستا لە واقیعێکی زۆر دژوارو خراپدا دەژین: لە ڕووی نیشتمانییەوە، نیشتمانی کورد هەر لە پەیمانی شوومی (سایکس - بیکۆ) وە، کە لە ساڵی ١٩١٦ز دا لە نێوان بەریتانیاو فەرەنساو ڕووسیادا بەسترا، دواییش زلهێزەکانی

دیکـەش دەسـتیان لـە پشـتدان، هـەر لـەو کاتـەوە نیشـتمانی ئێمـە، نیشـتمانی نەتـەوەی کـورد وەک گۆشـتی خێـرێ بەخشراوەتـەوە بەسـەر چـوار وڵاتی دراوسـێدا، بـەشی زۆرتـری بـە تورکیـاوە لکێـنراوەو، بەشـێکی بـە عێراقـەوەو، بەشـێکی بـە ئێرانـەوەو، بەشـێکی بـە سـووریاوەو، بەشـێکیشی لـە هەندێـک لـە ویلاتـە پێشـووەکانی یەکێتـی سـۆڤیەتی پێشـوودایە.

لـە ڕووی نەتەوەییەوە، کە نیشـتمان دابەش دەکـرێ، نەتەوەش بە هەمان شـێوە هەر بەش بـەش دەکـرێ و، نەتەوەکەشـمان هەر بەو شـێوەیە، ئنجا ئێمە ئەم حاڵەتـە، بە حاڵەتێکی ناشـەرعیی دەزانین و بە سـتەمێکی نەتەوەیی دەزانیـن و، بە سـتەمێکی دینیشی دەزانین ،کە لە نەتەوەو نیشـتمانی ئێمـە کراوە.

کاتی خـۆی دوای پەیـمانی شـوومی سـایکس - بیکـۆ لـە ١٩١٦ز دا، پەیمانێکـی دیکـە بەسـترا لـە نێـوان زلهێـزەکانی ئەوکاتـەدا، بەتایبـەت بەریتانیـاو فەڕەنسـاو ڕووسـیا، پەیـمانی سـیڤەر، کـە لـە بەنـدەکانی: (٦٢) و(٦٣)و (٦٤)ی ئـەو پەیماننامەیـەدا، دان بـە مافـەکانی نەتـەوەی کـورددا هێندرابـوو، کـە هەرکاتێـک ئـەو نەتەوەیـە ویسـتی، دەتوانـێ قـەوارەی سیاسـیی خـۆی هەبـێ، کورتەکـەی ئەوەیـە، بـەڵام دوایـی لـە سـاڵی ١٩٢٣زدا، هـەر ئـەو زلهێزانـەی کـە ئـەو کاتـە خۆیان بـە کوێخای دنیـا دەزانی، پەیـمانی لۆزانیـان بەسـت و هەرچـی لـە پەیـمانی سـیڤەردا گوتبوویـان، هەموویـان هەڵوەشـاندەوەو بـە جۆرێکـی دیکـە دەسـتیان کـرد بـە تەخشـان و پەخشـانی میـراتی دەوڵـەتی عوسـمانیی و، دەسـت بەسـەرداگرتنی دنیـا بەتایبـەتی دنیـای ڕۆژهـەڵاتی نێوەڕاسـت کـە ئـەو نـاوە جوگرافیەیـان لێنـا، بـۆ ئـەوەی پێـی نەڵێـن عالەمـی ئیسـلامیی،

ئێمە لەو کاتەوە ئەو واقیعە شوومەی کە ئێستا تێیدا دەژین، بەسەرماندا سەپێندراوە، کەواتە: ئەو واقیعە ستەمکارانەیەی کە نیشتمان و نەتەوەی ئێمە بەدەستیەوە گرفتارە، هۆکارەکەی ئیرادەی زاڵمانەی زلهێزەکانی ئەوکاتە بووەو، هی ئێستاش کە تەکریسی ئەو واقیعە زاڵمانەیە دەکەن، ئەو کاتە ئەمریکا وەک ئێستا زلهێز نەبوو، بەڵام لە دوای شەڕی جیهانی دووەم، ئەمریکا بوو بەو زلهێزە کە ئەویش کە هەر تەکریسی ئەو واقیعەی کردەوە، جەختی لەسەر ئەوە کردەوە، ئەو بڕیارانەی کاتی خۆی زلهێزەکانی پێشوو دابوویانن.

بەڵام ئایا بۆ خۆشمان بێ خەتاین؟ نەخێر، هەمیشە بە هەڵەی دەزانم دەستی چەوری خۆمان بەخەڵک بسڕین و خۆمان وەک بەرزەکی بانان دەرچوێنین، وەک چۆن ئەو زلهێزانە خەتاباری یەکەم بوون، خۆشمان بێ خەتا نەبووین، خۆشمان لە نێو خۆدا ناتەبایی و دڵ و عەقڵ گچکەیی، تەنیا بیرکردنەوە لە خێڵ و هۆزو بنەماڵەو بەرژەوەندییەکانی خۆو، پێکەوە ناکۆک بوون، کە هەتا ئەم کاتەش ئێمە بەو دەردەوە دەناڵێنین، ئەوە لە باشووری کوردستاندا خۆتان دەیبینن کە وڵات، بە دەست خۆمانەوەیەو ماوەی (٣٠) سی ساڵە ئێمە حاکمی ئەم بەشەی کوردستانین، بەڵام دەبینن چۆن ئیدارە دەدرێ: کە هەم لە ڕووی جوگرافییەوە بەشمان کردوە، هەم لە ڕووی سیاییەوە، هەم لە ڕووی ئیدارەو بەڕێوەبردنەوە.

بەڕێزان! لێرەوە دڵسۆزانە سەرنجی هەموو لایەک ڕادەکێشم، چ ئێوەی بەڕێز، چ لە پشت ئێوەوە هەرکەسێک کە گوێی لە قسەمانە، بۆ چەند شتێک:

باشـە ئـەوە زلهێـزەکان کاتی خـۆی کوردسـتنانیان لـێ دابەشـکردین، نەتـەوەی کوردیشـیان پارچـە پارچـە کـرد، ئـەوە زوڵمێکـەو ئۆباڵێکـەو لـە ئەسـتۆیاندایە، بـەڵام ئـەدی گەلـە دراوسـێ مسـوڵمانەکانمان، عەرەب و تـورک و فـارس، بۆچـی بـەو نەخشـەیەوە پابەنـد بـوون؟ بۆچـی ئـەو ئـاوەی ئـەوان ڕشـتیان، ئەوانیش پێیان ڕێ خسـت؟ بۆچی تەکریسـی ئەو واقیعـە زاڵمانەیـان کـرد؟ بێگومـان بـە ئەنـدازی ئـەوە کـە تەکریسی ئەو واقیعـە زاڵمانەیـە دەکـەن، خەتابارن، باشـە گریـمان ناتوانن بڕیـار بدەن بۆ دەوڵەتێکی کوردسـتانیی، بەڵام خۆ هەرکام لە ئێران و تورکیاو سـووریاو، عێراقیـش دیـارە کـە دۆخەکـە جۆرێکی دیکەیـە، دەتوانـن بڕیار بـدەن بۆ هەرێمێکـی فیـدڕاڵ، یـان لانـی کـەم ئۆتۆنۆمییەکـی ڕاسـتەقینە بـۆ ئـەو کوردسـتانە کە لکێندراوە بەوانەوە، ئەو نیشـتمانە کـوردەی کە خەڵکێک لەسـەری دەژی بـە نـاوی نەتـەوەی کـورد، هەڵبەتـە ئێمـە لێـرەدا بـاسی نەتـەوەی کـورد دەکەیـن، ئەگەرنـا هەمـوو ئەوانـەی لـە کوردوسـتاندان کەمایەتییەکانـی وەک تورکـمان و مەسـیحییەکان و یەزیدییەکان و هتد، هەمـوو ئـە وانـە، ئەوانیـش هـەر چارەنووسـیان لەگـەڵ ئـەو نەتـەوەی کـوردەدا بووە.

هەروەهـا بـا گلەییەکـی دیکـەش لـە خۆمـان بکەیـن، بـا هـەر گلەیـی لـە گەلـە دراوسـێکان نەکەیـن، لـە عـەرەب و تـورک و فـارس، ئێمـە کە نەتـەوەی کوردین، تەماشـا بکـەن بزانن زمانی کوردییمان لـە کوێیە، بزانن عـادەت و نەرێتـی کوردییـمان لەکوێیـە، بـەرگ و پۆشـاکی کوردییمان لە کوێیـە؟ ڕۆژێکـمان دانـاوە لـە سـاڵدا بـۆ بەرگـی کوردیـی، ڕۆژێـک بـۆ پۆشـاکی کوردیی! باسـیش دەکەیـن دەڵێین: ئیمپریالیزمـی ڕۆژ هەڵات و ڕۆژاوا و داگیرکـەران و ئیمپریالیـزم، ئێمەی چەوسـاندۆتەوەو، دەوڵەتانی

دراوسێش ئەو چەوساندنەوەیەیان بەڕەسمیی دان پێدا هێناوە، ئەدی شتەکانی دیکەی کە بەدەست خۆمانن! ئەی هەڵگەڕانەوەی خۆمان، لە ڕابردووی خۆمان لە مێژوو و کلتوور و زمان و بەرگ و پۆشاکی خۆمان، ئەدی ئەوە خەتای کێیە؟ ئایا ئەوە جۆرێک نیە لە خۆ دۆڕاندن؟ لە تێشکان و بەزیین لە بەرانبەر ڕۆژئاواو کلتووری ڕۆژئاوادا؟! ئایا ئەوە جۆرێک نیە لە زەربی سفرکردنی مێژوو و ڕابردووی خۆمان؟ ئەگەر تەماشای شێرە ژنان و کەڵە پیاوانی مێژووی خۆمان بکەین، هەموویان بەرگ و پۆشاکیان، کوردییە، هیچ شتێکی دیکەیان نیە، هەموویان بە زمانی کوردیی ڕەسەن دواون، هەموو ناوونیشانەکانیان بە کوردیی بوون، لەو کاتەوەی دەرکی ئەوەیان کردوە کە ئەوان گەل و نەتەوەیەکن، چونکە پێشتر ئەدەبیاتی عەرەبیی و فارسیی و تورکیی زاڵ بووە، مەبەستم ئەوەیە کە هەندێ شتیش خەتای خۆمانە و، دەبێ بە خەتای خۆشمان بزانین.

ئنجا ئەو ناتەبایی و دوو بەرەکییە، کە وەک گوتم لەم بەشەی کوردستانی خۆمان و، لە بەشەکانی دیکەی کوردستاندا، هەر حیزبێک دەسەڵاتی دەبێ، ئەوەندەی کە دەسەڵاتی هەیە بۆ خۆی مۆنۆپۆڵی دەکات، بۆ خۆی زەوتی دەکات، پێی وایە دەبێ بەس خۆی، خاوەنی قسەبێ، هەمان ستەم کە عەرەب و تورک و فارس کردوویانە، ئەویش وەك ئەوان دەکات، کە لە ڕاستییدا، ئەوە زوڵمێکە بۆ خۆمان لە خۆمانی دەکەین و کەس لێمانی ناکات.

بۆیە من پێموایە چارەسەری کێشەی نیشتمانیی و نەتەوەیی ئێمە، بەوە دەبێ کە سەرەتا ئێمە بڕوامان بەوەبێ کە ئێمە خاوەنی نیشتمانێکین و، دەبێ نیشتمانەکە ئازادو سەربەست بێ و، خاوەنی

نەتەوەیەکیـن و، پێوسـتە ئـەو نەتەوەیـە لەسـەر ئـەو نیشـتمانە خـاوەنی قـەوارەی سیاسـیی خـۆی بێـت، بـەو شـێوەیە کـە بـۆی دەگونجـێ، ئـەوە بـە نیسـبەت هەمـوو بەشـەکانی کوردسـتانەوە، بـە نیسـبەت خۆمانـەوە، لێـرە: هەرێمـی کوردسـتان، پێویسـتە کاری زۆر جیددیی بکەیـن کە ئێمە سـەرەتا هەرێم بگێڕینەوە بۆ سـنووورە ئاسـاییەکانی خۆی، پێش ڕیفراندۆم، حەقـی خۆمانـە هەموو ئـەو ناوچانەی کە بـە کوردسـتانیی دادەنرێن، کار بکەیـن ئەوانـە بگێڕدرێنـەوە بۆ سـنووری هەرێـم، دەزانم زەحمەتـە، بەڵام ئـەوە هـەق و مافێکـە و دەبـێ لەسـەری بچین و، ئێمـە ئەوە بـە ئەرکێکی شـەرعیی دەزانین.

هەروەهـا پێویسـتە کاری جیددیـی بکەین لەگەڵ حکوومـەتی نێوەندیی دا، بـۆ یەکلایـی کردنـەوەی ئـەو مەسـەلانەی کێشـەیان لەسـەرە و جێـی مشـت و مـڕن، ئـەوە چەنـد سـاڵە ئێمـە دەسـتوورمان دانـاوەو چەنـد لیژنەیـەک دانراون،بـەڵام هیـچ! چەنـد جـار بەشـداریی لـە حکومـەت دا کـرا، حیزبـەکان دەچـن بـە دەم ئیمتیـازە حیزبیـی و تایبەتییەکانـی خۆیانـەوە، بـەڵام ئـەو کێشـانەی کە پەیوەسـتن بە هەمـوو هەرێمـەوە، بە هەمـوو خەڵکـی عێراقـەوە بـە هەرێمـی کوردستانیشـەوە، ئـەو کێشـانە کاری جیددییـان لەسـەر نەکـراوەو، لە ڕاسـتییدا ئـەو ئامانجە گشـتییانە بـە قوربانیـی شـتی دیکـەی گچکەتـر کـراون.

# تەوەری سێیەم

# لە ڕووی سیاسییەوە

ئێمە ئێستا وەک کۆمەڵی ئیسلامیی بڕیاری ئۆپۆزسیۆن بوونمان داوە، بەڵام ئۆپۆزسیۆن (معارضة) بوون بە نەفەسی خۆمان، لاسایی کەسمان نەکردۆتەوە، زەقترین هەڵوێستی جیاکەرەوەی ئێمە وەک ئۆپۆزسیۆن ئەوەیە، کە دڵسۆزبووین بۆ هەموو لایەک، بە چاوی دوژمن تەماشای حکوومەتمان نەکردوەو ناشیکەین، وانین خەون بەوە ببینین خەڵک ناشیرین بکەین و خەڵک بڕووخێنین، چونکە ئێمە لە وڵاتێک و لە نیشتمانێکداین و، هەموومان خاوەنی قەوارەیەکی سیاسیین، بە کردو کۆشش و خەباتی هەموو لایەک هاتۆتە دی، بۆیە ئێمە ئۆپۆزسیۆنین، وەک ڕەخنەگرتن لە حکوومەت و لە ئەدای حکوومەتو ڕاستکردنەوەی هەڵەکانی و، چاککردنی و گەشە پێدانی حکوومەت کە لە ئاستی داخوازییەکانی خەڵک و چاوەڕوانی خەڵک و جەماوەرماندا بێ، ئنجا کە بووینە ئۆپۆزسیۆن، شتێکی دیاریکراوبوو، کتوپڕ نەبوو، شتێک نەبوو هەر وا خەیاڵێک بێ بەسەرماندابێ، بەڵکو بە پێشبینیی وامان دەهاتە بەر چاو ئەو حکوومەتەی کە دروست دەبێ، حکوومەتێکی حیزبیی و ئەمنیی دەبێ، کە ئەوە ئێستا زۆر جوان دیارە، بۆیەش کاتی خۆی ئێمە تەسریحێکماندا گوتمان: ئەم حکوومەتە بە شایستەی ئەوە نازانین تێیدا بەشداربین، بەڵام دوژمنی نین و، پێمان خۆشە هەڵە نەکات و، پێمان خۆشە ئەدائێکی باشی هەبێ و حکوومەتی هەموو

لایـــەک بێ و دڵســـۆز بێ بـــۆ هەموو لایـــەک، کە ئـــەوەش ئەرکی هـــەر حکوومەتێکـــە، ئنجا ئۆپۆزسـیۆن بوونی ئێمـــە کاریگەر بوو، چ لـــە نێو هەرێمی کوردســـتاندا، چ لـــە ئاســـتی پەرلەمانتارانمان کە دیارە ڕۆڵی ســـەرەکیی لە ئۆپۆزســـیۆنبووندا، پەرلەمان دەیگێڕێت، چ لە بەغداشدا.

هەروەهاش هەمیشـــە هەوڵماندا وە هەڵوێســـتەکانمان هاوســـەنگ بن و دڵســـۆزانەبن، ئنجا ئەگـــەر تـــەڕەفی بەرانبەر بـــە جۆرێکی دیکە بیخوێنێتـــەوە، ئـــەوە خەتـــای خوێندنـــەوەی هەڵەی خۆیـــەتی، بەڵام لە ڕاســـتییدا کاتێک فڕاکســـیۆنی ئێمـــە دەڵێ: دەبـــێ حکوومەت و ســـەرۆکی حکوومەت بپرســـێندرێ و پەلکێش بکرێ بـــۆ پەرلەمان و وەڵامی ئەو پرســـیارانە بداتەوە، ئایا ئەوە دڵســـۆزیی نیە؟، دۆســـت ئەو کەســـەیە دەتگرییێنـــێ، دوژمن ئەو کەســـەیە پێت پـــێ دەکەنێ، من کـــە دەڵێم: ئـــەو هەڵەیە مەکـــەو، وابکـــەو وا مەکـــە، ئەگەر نا ســـەرت بە فەتارەت دەچێ، دەبێ زۆر سوپاســـم بکـــەی، نەک بڵێی: ئـــەوە لە پشـــت پـــەردەی ڕەشـــەوە تەماشـــامان دەکات و دەیانەوێ ئێمـــە بڕووخێیـــن، نا، مـــن دەمـــەوێ نەڕووخێی، بۆیـــە ڕەخنەت لێ دەگرم، ڕەخنەو ئۆپۆزســـیۆن بـــوونی ئێمە بنیاتنەرانەو دڵســـۆزانەو بە پەرۆشـــانە بووە.

ئنجا ئێمە لـــە پەیوەندییە سیاســـییەکانماندا، بـــەردەوام هەوڵماندا وە کە ئـــەوەی ســـەنگی مەحەک و پێـــوەرە بـــۆ ئێمـــە، بەرژەوەندیی گشـــتیی بێ، چ لە بەغدا، هەر کێشـــەیەک هاتبێتە پێش، فڕاکسیۆنی ئێمـــە لە بەغـــدا، ئەگەر بـــە قەبارەش کەم بـــوون، بەڵام بـــە مەعناو

بەکاریگەریی زۆر بوون، میسداقیەتیان هەبووە، هەوڵمانداوە لەگەڵ هەموو ئەو کێشە ڕەوایانەدا بین، کە هەرێمی کوردستان لەگەڵ حکوومەتی نێوەندیدا، هەیبوون، بەڵام مەرجیش نیە لە هەموو شتێکدا هەر بەو شێوەیە ڕەفتارمان کردبێت، کە لێرە هەردووک حیزبی حکومڕان پێیان خۆشە، چونکە مەرج نیە ئێمە هەردوو حیزبی حکومڕان لە هەموو شتێکدا بە حەق بزانین، هەر شتێک بە حەقی بزانین، پشتگیریی دەکەین، بەڵام دڵنیاین کە لێرەیش کەم و کوڕیی زۆرەو، کەم و کووڕییەکانی خۆمانن کە حکوومەتی نێوەندیی بە دەم چاوماندا دەدەنەوە.

ئایا لەمەودوا چی بکەین لە ڕووی سیاسییەوە؟ جارێ پێمانوایە کە دەبێ بە جیددیی و بەکردەوە دەست بکەین بە پاکسازیی و چاکسازیی.

پێش کایەکانی ژیان، پێش لایەنی سیاسیی و ئابووریی و ئیداریی، دەبێ لە عەقڵ و دڵی خۆماندا پاکسازیی و چاکسازیی بکەین.

ئنجا با من بۆتان ڕوون بکەمەوە: ئایا ئەو کەسەی کە بە شێوەیەک ئیدارەی ئەم وڵاتە دەدات، بە بەرژەوەندیی خۆی و بنەماڵەکەی و عەشیرەت و حیزبەکەی تەواوبێ، بەڵام بە زەرەری کۆی خەڵک تەواوبێ، بۆچی وا دەکات؟ بێگومان چونکە جۆری بیرکردنەوەوەو هەست و نەستەکەی وایە، بۆیە دەبێ لە عەقڵ و دڵەوە ئێمە هەوڵبدەین بارو دۆخەکە ڕاست بکەینەوە، دەبێ شێوەی بیرکردنەوەکەمان ڕاست بکەینەوە، وڵات ئاوا بەڕێوە

نابـــردرێ، کـــێ ئەو مافـــەی بە تـــۆ داوە کـــە تۆ خۆت بـــە خاوەنی بـــن زەویـــی و ســـەر زەویی و هەمـــوو شـــتێکی ئەم وڵاتـــە بزانی، خەڵکـــی دیکـــە بـــە هیچ نـــەزانی، کێ ئـــەو مافـــەی بەتـــۆ داوە؟ لـــە ڕاســـتییدا دەبـــێ بیرکردنەوەو هەســـت و نەســـتەکان ڕاســـت بکرێنـــەوە، خوا فەرموویـــەتی:﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَـــيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَـــتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ ١١﴾الرعد.

واتە: خوا واقیعی هیچ کۆمەڵگایەک ناگۆڕێ، ( واتە: واقیعی سیاســـیی و کۆمەڵایەتیـــی و ئابووریی ) تاکو ئـــەوان دەروونی خۆیان نەگۆڕن، دەروون واتـــە جۆری بیرکردنەوەو، جۆری هەســـت و نەســـت و خولیاو نیـــەت، دەبێ لەوێوە گۆڕانکاریـــی بکەین و دەبێ لەوێوە پاکســـازیی بکـــرێ، دەبێ لەوێوە قیادەی سیاســـیی کـــورد، ئەوانەی تاکو ئێســـتا لـــەم وڵاتەدا ئەمـــرو نەهییان بەدەســـتە، دەبێ لێرەوە خۆیـــان بگۆڕن، بزانـــن کە ئەم وڵاتە هـــی هەموو لایەکـــە، خوا دەفەرمـــوێ:﴿وَٱلۡأَرۡضَ وَضَعَهَا لِلۡأَنَامِ ١٠﴾الرحمن.

واتـە: خـوا زەوی بـۆ خەڵـک دانـاوە، نەیفەرمـووە بـۆ فـڵان مـاڵ و فڵانکـەس و فـڵان حیـزب و، بـۆ کەمیەنەیەکـی ملیاردلێـر! نـا، بـۆ خەڵـک، بـە گشـتی هـەروەك خـوای دادگـەر دەفەرموێ:﴿خَلَـقَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعًا ١١﴾البقرة.

واتـە: ئـەوەی لـە زەویدایـە بـۆ هەمووانتانـی دروسـتکردوە...، هەروەها دەفەرمـوی: ﴿كَيۡ لَا يَكُـونَ دُولَـةَۢ بَـيۡنَ ٱلۡأَغۡنِيَـآءِ مِنكُمۡۚ ٧﴾الحشر.

واتە: با ماڵ و سامان لە دەستی دەوڵەمەندەکانتاندا کورت هەڵنەیەت، کەمینەیەک ببنە ملیاردلێر لە حیزب و خزم، زۆرینەکیش بەو شێوەبن کە دەبینرێ، دەبێ ئەو بیرکردنەوانە ڕاست بکرێنەوە، ئنجا دەتوانین لە کایەکانی دیکەدا، چاکسازیی و پاکسازیی بکەین.

ئنجا ئێمە بڕیارمان وایە کە «خوا پشتوانبێ» بەردەوامیی و درێژە بدەین بە هاوسەنگیی سیاسیی خۆمان و دڵسۆزیی خۆمان بۆ هەموولایەک، هەروەها بڕیارمان وایە کە پابەندیی باشتر بە بنەماکانەوە بکەین و، جەختکردنەوەی پتر لەسەر هەر چی زیاتر لە سەنگەری ستەم لێکراوان دابوون و، وەستان لەبەرانبەر ستەمکاران و خۆسەپێناندا، هەروەها هەوڵ دەدەین کاری جیددیی زیاتر بکەین، بۆ هەرچی زیاتر فراوانکردنی بازنەی کۆمەڵی ئیسلامیی، ئەم کۆمەڵی ئیسلامییە کە خەڵکێکی زۆر هیواو ئاواتی خۆی پێدا هەڵواسیوە، خەڵکێکی زۆر ئومێدی خێر و متمانەی پێی هەیە، متمانەو ئومێدەکەشیان، خوا پشتیوانبێ لە جێی خۆیدایە، ئەم کۆمەڵی ئیسلامییە «لەو برایەی خۆتانی وەربگرن» بەم قەبارەو ناو و نیشانەی ئێستای، نابێتە جێی متمانەو ئومێدی خەڵکێکی زیاترو، دەبێ هەوڵبدەین کۆمەڵی ئیسلامیی فراوانتربکەین، ئنجا بۆ ئەوەی فراوانتری بکەین و تاکو سێبەرەکەی و باوەشەکەی فراوان وگەورەتربێ و، جێگای ئومێدی خێری خەڵکی زیاتربێ، دەبێ ناو و نیشان و ئامڕازەکان و شێوازەکانی کاری و هەرشتێک گەشەپێدانی کۆمەڵی ئیسلامیی پەکی لەسەری بکەوێ، بیگۆڕین، ئەوانەی ناتوانن خۆیان بگۆڕن

ناشتوانن خەڵک بگۆڕن، کەسێک واقیعی پێ دەگۆڕدرێ، خۆی پێ بگۆڕدرێ، خوا وا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ ١١﴾ الرعد.

واتە: ئەگەر خۆمان نەگۆڕین، خەڵکمان چۆن پێ دەگۆڕدرێ؟ ئەگەر خۆمان وا لێ نەکەین کە خەڵکێکی زیاتر لێمان بێتە پێش و لەگەڵماندا هاوکارو دەستبارگربێ، چۆن دەتوانین، گۆڕانکاریی بکەین؟ با خەڵک هەمووی نەیەت نوێژی جەماعەتمان لەگەڵ بکات، بەڵام با بێن لەگەڵماندا هاوکاربن بۆ ڕیشەکێشکردنی ستەمکاریی، گەندەڵیی، پۆخەڵیی، قۆرخکاریی و بۆ چەسپاندنی دادگەریی.

هەموومان پێویستیمان بە دادگەریی هەیە، هەموومان لە زوڵم و ستەم و لە قۆرخکاریی زەرەرمەندین، ئەو شتەی کە هەموومان پێویستیمان پێی هەیە، بۆ هەموومان باشە، با هەوڵ بدەین بە هەموومان بیچەسپێنین، ئەو شتەی بۆ هەمووان خراپە، با بەهەمووان هەوڵ بدەین ڕیشەکێشی بکەین، ئێمە وەک کۆمەڵی ئیسلامیی بە تەنیا ئەوەمان پێناکرێ، بەم قەبارەی ئێستاو بەم شێوەی ئێستا، بۆیە دەبێ خۆمان وا لێبکەین کە خەڵک «وەک گوتم» لەگەڵماندا زیاتر هاوکارو دەستبارگربێ، کە دوایی من لە کاتی موناقەشەکردنی مادده و بڕگەکانی پەیڕەوی نێو خۆدا، هەندێ پێشنیارم دەبن، عەرزتان دەکەم، بەڵام لێرە هەر بەگشتیی دەیڵێم.

هەروەها ئێمە دەبــێ کاری زیاتر بکەین بۆ لەیەک وەنیزیکخستنی بەشەکانی تەوژمی ئیسلامیی، لەم وڵاتی ئێمەدا خەڵک مسوڵمانە بەگشتیی ، لایەن و کەسانێک هەن کاردەکەن بۆ ئیسلام کە لەچوارچێوەی تەوژمی ئیسلامییدا کۆبوونەتەوە، ئێمە دەبێ ئەو تەوژمە ئیسلامییە زیاتر لەیەک وەنیزیک بخەین، دەبێ زیاتر کاری پێکەوەیی و تەبایانە بکەین، پێکەوە هاوکاریی و دەستبارگریی بکەین، کاتی خۆی زۆرمان گوتوە، بەڵام پێویستە لێی ماندوو نەبین، دواجار نیزیکترین کەس لە ئێمەوەو لە پرۆژەو کارو ئامانجمان، ئەو خەڵکەن کە لە چوارچێوەی تەوژمی ئیسلامییدا خۆیان دەبیننەوە، هەڵبەتە بۆ ئەوەش هەرشتێک پێویست بکات لە تەبایی و برایەتیی و لە چوونە پێش، وەک لە ڕابردووشدا کردوومانە، لە داهاتووشدا دەبێ ئاوی لێ نەخۆینەوەو ئامادەی هەر هەنگاونانێکین، کە ئەو لەیەک نیزیکی و تەبایی و پێکەوە کارکردنە، پەکی لەسەری بکەوێ.

لێرەشەوە من دەستخۆشیی دەکەم لە هەموو ئەو خەڵکانەی کە لەم گۆڕەپانی هەرێمی کوردستان و دەرەوەی هەرێمی کوردستانیشدا، کار دەکەن ،بۆ ئەوەی جارێکی دیکە ئیسلام و شەریعەتی خواو وەحیی خوا بکەنەوە کاڵای باڵای ژیانی ئەم خەڵک و وڵاتەو، هەموو ئەوانەی کە کار دەکەن، چ لە حیزبیی سیاسیی دا، چ لە ڕێکخراودا، چ لە هەر هەوڵێکی خێرخوازییدا، دەست خۆشیی لە هەموویان دەکەین و هەموویان بە نیزیکی خۆمان دەزانین.

# تەوەری چوارەم

# لە ڕووی ئابووریی و گوزەران و چەسپاندنی دادگەرییەوە

ئەندامـــانی بەڕێــزی کۆنگـــرەی چوارەمـــی کۆمەڵی ئیســـلامیی خوشـــکان و برایان! لـــە واقیعی ئێســـتامان دا لـــە ڕووی ئابووریی و ژیـــان و گوزەرانـــەوە، وەک دەیبینین، قڕیی و پڕیـــی و چینایەتییەکی زۆر هەیـــە، قۆرخکاریـــی و گەندەڵییەکی زۆر هەیە، کە لەڕاســـتییدا وشـــەی گەندەڵیی و قۆرخکاریـــی، پێموایە کەمـــە، لەبەرانبەر ئەوەدا کە ئێمە لە هەرێمی کوردســـتاندا دەیبینین، من لە هەولێردا دادەنیشـــم و دەزانـــم چی دەگوزەرێ، لە ســـلێمانیی و لە دهۆک و لـــە هەڵەبجە و، لە هەموو شـــوێنەکان، دەزانیـــن چ دەگوزەرێ، زۆرێـــک لەوانەی کە باڵادەســـتن ،خۆیان بە خاوەنی موتڵەقی ســـەرزەویی و بـــن زەویی ئەم وڵاتـــە دەزانن، بەڵکـــو خەڵکەکەش بـــە خزمەتکارو کۆیلـــەی خۆیان دەزانـــن، کەی ئەمە ویـــژدان و دینە! کوا دیموکراســـیی و مافی مرۆڤ وا دەڵێ؟ پێـــش ئەوانەش کوا شـــەریعەتی خواو دینی خـــوا وا دەڵێ؟ ئێمـــە هەمووومان مرۆڤین و، لەســـەر ئـــەم زەوییە خـــوا ڕزقی ئێمەی خســـتۆتە ئەم وڵاتەوە، هەموومـــان لەو خێرو بێرەدا بەشـــدارین، بۆچی دەبێ خێـــرو بێرەکە، هەمووی بچێتە دەســـتی چەند کەســـێک و چەندماڵێـــک و کەمینەیەکـــەوە، کە پارەو ســـامانەکەی ئەوەنـــدە زۆربێ، لێرە نەحەوێتـــەوەو حەواڵەی بکات بۆ دەرەوە، بـــەڵام خەڵکی دیکەش ســـەد مەتر دووجای دەســـت نەکەوێ، کە لـــە کۆڵێتـــە خانوویەکدا

بـــژی؟ ئایا بۆ ئـــەوە خەبات کرا؟ ئێمـــە کاتی خۆی پێشـــمەرگە بووین هەموومـــان وەک یـــەک بوویـــن، بـــەرگ و، پۆشـــاکمان، پێڵاومان، جێـــگاو ڕێگامـــان، هەموومان وەک یـــەک بووین، ئەدی ئێســـتا بۆ چـــی هەندێک چوونە ئاســـمان؟ لەکوێ دەوڵەمەنـــدی وات بینیوە، هەر ســـەعاتەی ســـەد دەفتەر بکەوێ، لەکـــوێ بووە ئەو جۆرە کاســـبییە، ئێمـــە نازانین چـــۆن ئەوانە ویژدانیـــان ڕۆژێک لـــە ڕۆژان خەبەریان ناکاتەوە، نازانـــن دوایی هەموومان دەچینەوە بـــەر دادگای خوا، نازانن کە ئێمە ڕۆژێک دێـــت لێمان دەپرسرێتـــەوە، نازانم ئـــەو ملیاردلێرانە بە پـــارەی حەڕامی خەڵـــک و وڵات چۆن خەویان لـــێ دەکەوێ، ئاهو ناڵـــەی هەندێ لـــەو فەقیرو داماوانـــەی کە لە تەلەفزیۆن دەبیســـتن: چۆن دەژیـــن و چۆن بەکولـــە مەرگیـــی دەیگوزەرێنن، چـــۆن ئەوانە خەویان لـــێ دەکەوێ؟!

بۆیـــە واقیعەکەی ئێســـتامان پڕە لە قڕیـــی و پڕیـــی و چینایەتیی، کەمینەیەک لە ســـەریانەوە ڕژاوە و، زۆرینەیەکیـــش لەبەریان بڕاوە، کەمینەیـــەک لە حیـــزب و خزم، بوونـــە ملیاردلێـــر و، زۆرینەیەکیش ئاتـــاج و نەدار!.

ئەم وڵاتـــەی ئێمـــە تاڕاددەیەکـــی زۆر ژێرخانی ئابووریيـــمان نیە، ئـــەم وڵاتەی ئێمـــە زۆربەی گەنجـــەکانی عاتڵ و باتـــڵ دەخولێنەوە، ســـەری خۆیان هەڵدەگرن بـــۆ هەنـــدەران دەڕۆن، لە جیـــاتی ئەوەی بێنیـــن کارگە دروســـت بکەین و بەرهەمـــی خۆماڵییـــمان هەبێ، ئەم وڵاتە بۆتە بازاڕی ســـاغکردنەوەی کاڵای وڵاتانی دراوســـێ و وڵاتانی

دوورو نیزیک، دوای (٣٠) ساڵ حوکمی خۆ جێیی، دوای سی ساڵ وڵات بەڕێوەبردن، دەبوو ئاوابین؟ جادەو ڕێگاوبانمان ئاوابێ؟ دەبوو ژێرخانی ئابوورییمان لە ڕووی کشتوکاڵ و ئاژەڵداریی و پیشەسازیی، بەو شێوەیە بێ؟ هەر قەسرو ڤیللا بەرز دەکرێنەوە، بەڵام لەسەر حیسابی نەبوونی کارگان و، ئەو کارگانەی کە کاتی خۆشی هەبوون لەسەردەمی ڕژێمی گۆڕ بە گۆڕدا، ئەوانەش هەموویان حەپەلۆش کران و فرۆشراون داخران.

ئەگەر باسی ئەوە بکەین کە چەند دەرمان و خواردنی ئێکسپایەر دێتە ئەم وڵاتە، ئەو بەرپرس و دەوڵەمەندانەی کە لەگەڵ بەرپرسە گەندەڵەکاندا شەریکە دزن، بە قوڕگی ئەم میلەتەیدا دەکەن، خەڵکێکی زۆر تووشی جۆرەها نەخۆشیی شێرپەنجە بوون، کە ئەوە بەڵایەکی زۆر گەورەیەو، دەبێ بزانین لەچ واقیعێکدا دەژین.

بێگومان ئەم واقیعەی ئێستای ئێمە سیخناخە لە نائومێدییەکی زۆر، کە من لێرەوە بە هەموو لایەک دەڵێم: مرۆڤ نابێ نائومێدو ڕەشبین بێ، کاتێ هەڵبژاردنێک دێتە پێش، بچۆ بەو شێوەیە دەنگ بدە کە پێتوایە حەق دەچەسپێ و، ستەم و ناهەقیی لا دەچێ و، کۆتایی پێ دێت، نەک دەستەو ئەژنۆ دابنیشیی و لەبەر خۆتەوە پرتەو بۆڵە بکەی.

## چارەسەر لە چیدا دەبینین:

**یەکـەم:** دەبـێ ئێمە هەوڵ بدەین پەرلەمان و حکوومەت و دەسـتەڵاتی دادوەریـی لـە قورگـی حیـزب بێنینـە دەر، حیـزب هەمـوو شـتێکی هەڵلووشـیوە، حیـزب وایکـردوە نـە حکوومـەت حکوومـەت بـێ، نـە پەرلەمـان پەرلەمانبـێ، نـە دەسـتەڵاتی دادوەریـی دەسـتەڵاتی دادوەریی بـێ، بیسـتتان لـە ڕۆژانـی ڕابـردوودا، چۆن دادورەیـی کـرا؟ بـەر لەوەی دادوەریـی بکـرێ و دەرەنجامەکـەی دەربکـەوێ، چۆن ڕاگەیەنـدرا؟ ئەمە چـی پـێ دەگوترێ؟ دەبـێ هـەوڵ بدەین کار بکـرێ بۆ ئـەوەی حکوومەت سـەربەخۆ بـێ و، لـە قورگـی حیـزب بێتـە دەر، پەرلەمان دەبێ سـەربەخۆ بـێ و کانـگای بڕیـاردان و یاسـا دانـان و چاودێریـی حکوومـەت بـێ، من دەزانـم دادوەریـی بەڕێزمـان هـەن، خـاوەنی بیـرو ڕای خۆیانـن، بـەڵام بەداخـەوە وەک دامـەزراوە (مؤسسـة)ی دادوەریی، دەسـتەڵاتی قەزائیی ژێـر چەپۆکی حیزبە، کەسـانێک هـەن خەڵک دەکوژن، دوایـی لەو بازاڕە دەخولێنـەوە، لێـرە جێی نەبـۆوە، دەچێ بۆ ئەولا، لەولا جێـی نەبۆوە، دێ بۆ ئێـرە، بەڵام کەسـانێکی دیکـە لەبەر ئـەوەی ڕەخنە دەگرن لـە حکوومەت، یاخـود زانیارییـان لەگەڵ یەکدا گۆڕیوەتـەوە لەبارەی شـتێکەوە، ئەوە بە جەریمـەو تـاوان دادەنرێ!

**دووەم:** پێویسـتە کارێـک بکەیـن دەسـت هەڵبگیـرێ لـە تاڵانکـردنی خێـرو بێـری ئـەم وڵاتـە، نازانـم ئەوانە کـەی تێر دەبـن، بیسـتوومە هی وا هەیـە چەنـد ملیـاری هەیـە، بـرادەر تـۆ تاکۆتایـی عومـری خۆت بـۆ کەی دانـاوە و، دەتـەوێ چەنـدی دیکە بـژی؟ ملیاردێرەکانی دیکـەی دنیا چییان

لێ هات؟ ئەو وڵاتانەی کە هەموو شتێکی عیبادو بیلادیان بە هی خۆیان دەزانی، نەتبینین چییان لێ هات؟ تۆش چیت لێ دێ؟ خۆ ئەگەر خەڵکیش لێت ڕانەپەڕێ و خەڵکیش ژێرەو ژووت نەکات، هەر خۆت بە دەردی خوا دەمری.

پێویستە هەوڵبدەین ژێرخانی ئابوورییمان هەبێ، لەسەر پێی خۆمان بوەستین، چی دیکە ئەم وڵاتە بازاڕی ساغکردنەوەی کاڵای ئەملاولا نەبێ و، چیدیکە گەنجەکانی ئێمە لە کوڕان و لە کچان، بێ کارو بێ ئیش نەخولێنەوە، قوتابیی چەندین ساڵ دەخوێنێ، بە قەرزو قۆڵە بە نارەحەتیی و لەبەشی نێوخۆیی، کەچی دوای تەواوبوونی خوێندن کە دەردەچێ، تەعیین ناکرێ و کارێکی دەست ناکەوێ، چونکە کارێکی وایان کردوە ئیش و کار نەبێ لەم وڵاتەدا، لەحاڵێکدا ئەم وڵاتەی ئێمە پڕە لە کرێکاری بیانیی، تەنانەت ئەوانەی کە خزمەتی مزگەوتەکان دەکەن و، نێو شارو کووچەکان پاک دەکەنەوە، هەموویان بیانیین، کەچیی خەڵکیش هەیە لەبرسان خۆی دەکوژێ، ئەو کۆمەڵگایە زۆر خراپ ئیدارە دراوەو، پێویستە هەوڵ بدەین دادگەریی بچەسپێنین، **پێناسەی دادگەریی:** دادگەریی بریتیە لە وەرگرتنی ئەوەی کە مافی خۆتەو، دانی ئەوەی کە حەقە لەسەرت (أخذ ما لك و إعطاء ما عليك)، هەندێکی دیکە دەڵێن: دادگەریی بریتیە لە گێڕانەوەی ماف بۆ خاوەن ماف و، سپاردنی ئەرک بە بابای شایستە، هەندێکی دیکە دەڵێن: دادگەریی تاکە ئامڕازی مسۆگەری سەقامگیرییە، زۆر جار باسی تەبایی دەکرێ، باسی ڕێکیی دەکرێ، بناغەی تەبایی و ئاشتیی و کۆمەڵایەتیی، بریتیە لە دادگەریی.

**دادگەریی دەرەنجامی ئەمانەیە:**

مــاف و ئــەرک و ئازادیــی پێویســتە بــۆ هەرکەســێک دەســتەبەر بکرێــن، ســەرەوەریی یاســا، پێویســتە شــتێکبێ مشــت و مــڕی لەســەر نەبــێ، کاری دامەزراوەیــی پێویســتە بکــرێ، چاودێریــی و لێپێچینــەوە هەبــێ، لــە بەرپرســان بــە هەمــوو جۆرەکانییــەوە، ســتەم ڕیشــە کێــش بکــرێ، لــە ئەنجامــی ئــەوەدا، دادگەریــی دەچەســپێ، کەواتــە: دادگەریی شــتێک نیــە بــە زار بگوتــرێ، بەڵکــو پرۆســەیەکەو، دەرەنجامێکــە لــە کۆمەڵێــک پێشــەکیی پەیــدا دەبــێ.

# تەوەری پێنجەم

# لە ڕووی خێزانیی و کۆمەڵایەتییەوە

ئێستا لەم واقیعەماندا، کاری زۆر دەکرێ بۆ هەڵوەشاندنەوەی خێزان، بۆ بێسەرەو بەریی ئەخلاقیی و ڕەوشتیی، هەڵگێڕانەوەی ژن لە مێرد، مێرد لە ژن، کوڕو کچ لە باب و دایکیان، ئەگەر ڕاستەوخۆش پێیان نەڵێن، لەو کەناڵانەوە کە بەپارەی نەوتی دزراوی ئەم وڵاتە کار دەکەن، خەڵکێک لە تورکیاو ئێران و سووریاوە دێنن، گەنجەکانی ئێمە فێری داڕووخانی ئەخلاق و ناپابەندیی دەکەن، ئاخر کاتێک کە گەنجەکانت بەو شێوەیان لێهات کە ئامانجێك نەبێ لە ژیانیاندا، ئەو گەنجانە دەبێ چ ئومێدێکی خێریان لێ بکرێ، ئەم وڵاتە کە گەنجەکانی وایان لێ بێ، کە لە غەریزەکانی خۆیان سەرتر نەبینن، دەبێ چ ئایندەیەکی ڕەش و تاریک چاوەڕێیان بکات!!

هەروەها داڕووخانی ڕەوشت و ڕەواج پێدانی ڕەوشت نزمیی، من زانیاریم هەیە، لە هەندێ لەو شارانەی وڵاتی ئێمە، چەندان شوێنی تایبەت هەن، سەرپەرشتیی دەکرێن و، دام و دەزگای دژە تیرۆرو ئاسایش دەخلیان بەسەریانەوە نیە، بەڵکو دەستیان لە پشت دەدرێ کە نێرگەلەیان تێدا دەکێشرێ، بەڵکو زۆر لە نێرگەلە کێشان خراپتریشیان تێدا دەکرێ، کە شایستەی ئەوە نیە لەم مەجلیسەدا باسی بکەم، ئەدی دژە تیرۆرو ئاساییش لەکوێن، تا چارەسەری ئەو دیاردەو نەخۆشییە بکەن؟ ئەدی نازانن ئەمە شێر پەنجەیەکە

لـه هـەر میللەتێکـی بـدات دایدەڕزێنـێ؟ وەک حافیـز ئیبڕاهیـم دەڵـێ:

**وإنما الأمم الأخلاق ما بقيت فإن همو ا ذهبت أخلاقهم ذهبوا**

**کۆمەڵگاکان بریتین لە ڕەوشت، کە ڕەوشتیان نەما، دەڕۆن.**

تەماشای مێژووی یۆنانیی و فارسـەکان و ڕۆم و میسرییەکان بکەن، تەماشـای مێژووی دەوڵەتی ئیسـلامیی بکەن، هەموو ئەوانە کاتێک کە لـە ڕووی داڕووخانی ڕەشـتەوە، لە ڕووی نەمانی ئـاکارو بەها بەرزە ڕووحییەکانـەوە، خراپ بوون، کۆتاییـان پێهاتوەو داڕووخاون، خراپترین ڕەوشـتیش بریتیە لـە چینایەتیی و قڕیـی و پڕیی، هەروەها بوغڕابـوون، بوغڕابـوون بەو پارەو سـامانە حەرامەی کـە کەوتۆتە بەردەسـتیان و، بەو دەسـتەڵاتە موزەییەفەی کە بـە هەڵبژاردنی پڕ لە تەزویرو سـاختەکاریی بەدەسـتیان هێناوە، بەوە بوغـڕا بوون و ئەو هەموو خەڵکەمـان لەگەڵدایە، ئاخـر خەڵکت چـۆن لەگەڵدایە؟ بزانە ئـەو خەڵکە بـە قەناعەتـەوە لەگەڵ تۆدایـە؟ بزانە ڕاسـت دەکەی ئـەو خەڵکـەت لەگەڵدایە، یان بـە تەزویر و زار چەورکـردن، یان بە هەڕەشـە لێکردن و بە هەڵخەڵەتاندن؟!

**چارەسـەر:** پێموایە دەبێ هەمـوو لایەک بەتایبەت چینی سیاسـیی ئەگەر بیانـەوێ ئەم هەرێمە زایە نەبێ، سـەر بەرەو ئاسـمان هەڵبڕن، خوایان لەبیربـێ و ڕۆژی دواییان بیر بێتەوەو، سـەرەنجامی خۆیانیان بیربێتەوە، ئەگەر مسـوڵمانن و ڕاسـت دەکەن، هەمووتـان لە بیرتانە ئەوانەی کـە تەمەنێکتان هەیە کە تـازە ڕاپەڕین کرابـوو، لەمانگی ١٩٩١/٣ز دا، خۆتـان دەتانبینـی کە وەزع چۆن بـوو، خەڵک چونکە

ئومێـــدی هەبوو، کە ســـبەینێ حکوومەت و پەرلەمانمـــان دەبێ، کورد خاوەنی بـــوونی خۆی دەبـــێ، قەوارەی سیاســـیی خۆمانمـــان دەبێ، خەڵک ســـەبری دەگرت، ئەوکاتە خەڵک هاتوە، بـــۆلان بە کیلۆ داوای ئاردی کـــردوە، زۆر نەداریـــی و هەژاریـــی بوو، بەڵام لـــە لایەکەوە خەڵک ئومێـــدی هەبوو، لـــە لایەکی دیکەوەش بەرپرســـەکانی وەک خـــۆی دەبینین، ئەو کاتـــەش بەرپرســـەکان پێویســـتییان بە خەڵک بوو، وەک چۆن لە زەمانی شـــۆڕش و پێشـــمەرگایەتییدا، پێویستییهان بە خەڵـــک بوو، خـــوا خوامان بـــوو خەڵکێک فەرموومـــان بکات و شـــۆربایەکهان بداتێ، ئەو کاتەش بەرپرســـان و حیزبەکان پێویستییان بـــە خەڵک بوو، ئـــەو کاتە خەڵـــک حاڵەتێکی دیکەی هەبـــوو، بەڵام ئێســـتا دەبێ ئاینـــدە ببینین، ئەگەر ئێمە دوای ســـی (٣٠)ســـاڵ ئەمە بـــارو دۆخەکەمانبێ، دە (١٠)ســـاڵی دیکـــە بێننە بەرچـــاوی خۆتان، بەتایبـــەت کـــە بیرۆکـــەی لیبڕالیـــزم و ماددیگەریی و ، بـــە ئاژەڵ تەماشـــاکردنی مرۆڤ و بە ماددە تەماشـــاکردنی ژیان، ڕۆژ بۆ ڕۆژ لە دنیادا پەرە دەســـتێنێ.

ئەگەر ئێمە دوای ســـی (٣٠)ســـاڵ، ئەمە بەرهەمهان بێت، دەبێ دوای پازدە بیســـت (١٥-٢٠)ســـاڵی دیکە چیهان لێ بێ؟! پێویســـتە زۆر بە خێرایـــی بۆ ئەوەی لە ڕووی خێزانیی و کۆمەڵایەتییەوە چارەســـەرێکی ئەم دۆخـــە بکەین، ئەو کەناڵانەی کە ڕەوشـــتی خەڵـــک دەڕووخێنن، ئـــەدەب و بەهایـــەکان ناهێڵن، حورمـــەت و پیرۆزیی بـــۆ خێزان و بۆ خۆشەویســـتی نێوان ژن و مێـــردو دایک و باب و ڕۆڵـــەکان، ناهێڵن، پێویســـتە ئەو کەناڵانە بێ دەنگ بکرێن، با چـــی دیکە کۆمەڵگایەکەی

خۆمان بۆ خۆمان نەڕووخێنین، با چی دیکە بەدەستی خۆمان قەبر بۆ خۆمان هەڵنەکەنین، ئەوە قەبر هەڵکەندنە، ئەوە وەک کارەکەی مەلای مەزبوورەیە، کە لەسەر لقی درەختێ وەستابوو، هەر ئەو لقەشی دەبڕییەوەو پێش لقەکە خۆی کەوتە خوار!

پێویستە کاری جیددیی بکەین بۆ پەروەردەکردنی خێزان و تۆکمەیی کۆمەڵگا، ئێمە خەڵکی شارەزامان زۆرە لەم وڵاتەدا، ئەوانەی کە جاروبار لە کەناڵەکاندا و دەرفەتیان پێ دەدرێ قسە بکەن، خەڵکی پسپۆڕو شارەزاو دڵسۆزمان هەیە، با ئەوانە بوارو دەرفەتیان پێ بدرێ و، قسەو بیردۆزەو پێشنیارەکانیان تەبەننیی بکرێن.

# تەوەری شەشەم

## لە ڕووی فیکریی و ئیمان و بانگەوازو پەروەردەوە

زۆر جێی داخە لەوڵاتێکی مسوڵمانشیندا، زۆر سەرو گوێلاکی ئیسلام و عەقیدەی ئیسلامیی و فیکری ئیسلامیی و ئەخلاقی ئیسلامیی و بانگەوازی ئیسلامیی و پەروەردەی ئیسلامیی دەکوترێ، لە لایەن کێوە؟! لە لایەن کەناڵە وابەستەو دابەستەکانی ئەو کەسانەوە کە خۆیان بە سەرپەرشتیارو بەڕێوەبەری ئەم وڵاتە دەزانن، هەروەها ڕەواجی زۆر دەدرێ بە فیلم و هونەری ڕەوشت ڕووخێنەر، بە هونەری ژیان بۆ بایەخکەر، پێویستە ئەوانە بوەستێنرێن، چارەسەر ئەوەیە کە بگەڕێینەوە بۆ ئیسلامی بەرجەستە لە قورئان و سوننەتدا، تەنیا وەحیی خوایە بە کەڵکی هەموو کات و شوێنەکان دێ، بۆچوونی زانایان، ئیجتیهادی زانایان، فلان مەزهەب و بۆچوون، ڕەنگە بۆ کاتی خۆی باش بووبێ، بۆ کۆمەڵگایەکی دیارییکراو باش بووبێ، بەڵام بەس وەحیی خوایە، بەکەڵکی هەموو کات و شوێنەکان دێ.

هەروەها پێویستە کاری زیاتر بکەین لەبواری فیکری ئیسلامیی ڕاست و ڕەسەن و بانگەوازی ئیسلامیی و پەروەردەی ئیسلامییدا، ئێمە خۆمان وەک خەڵکی کۆمەڵ و هەندێ جاریش ڕووم لە کۆی خەڵک و جەماوەرەکەمانە، هەموومان بەرپرسیارین بەرانبەر بە ئایینەکەمان و، بەرانبەر بە میللەتەکەمان، پێویستە کاری جیددیی بکەین لە بواری

ئـەدەب و هونـەرو بەرهەمهێنـانی شـانۆو فیلمـی خۆماڵیـی‌دا، کـە تەعبیر بکـەن لـە ئاییـن و کلتـوورو ڕەسـەنایەتیی خۆمـان، نـەک هـەر فلیمـی تورکیـی و ئێرانیـی و ئەجنەبیـی بهێنرێـن و خەڵکیـان پێـوە سـەرقاڵ و سـەرگەرم بکـرێ و، گوێـش نـەدرێ، بـەوە کـە چ دەرهاویشـتەیەکیان لـێ دەکەوێتـەوە، کـە دەرهاویشـتەکەیان بریتیە لـە هەڵوەشـانی خێزان و دارِزانـدنی کۆمەڵـگا، هەروەها پێوسـتە ئەم واقیعە سیاسـیی و ئابوورییە پـڕ ستەم و قۆرخکارییـە بگۆڕیـن، چونکـە ئەمـە کاریگەرییەکـی زۆر گـەورەی هەیـە لەسـەر بەلاڕێدا بـردنی خەڵـک لـە ڕووی فیکریـی و ڕەوشـتیی و پەروەردەییەوە، کاتێک ئەو کەسـە چاو هەڵدێنێ و تەماشای سۆشـیال میدیـاو تەلەفزیـۆن دەکات، گـوێ هەڵدەخـات، هیـچ شـتێک نابیسـتێ کـە لە خـوای نیزیـک بخاتـەوە، لایەنـی ڕووحیی و ڕەوشـت و ئەدەبـی چـۆن تێـدا بەهێز دەبێ؟ من تا ئێسـتا لـەم وڵاتـەی خۆماندا جاری دیکـەش گوتوومەو ئێسـتاش دووبـارەی دەکەمـەوە: بەرپرسـێکی باڵای ئـەم وڵاتـەم نەبینیـوەو، لێم نەبیسـتوە باسی خـواو بـاسی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ڕۆژی دوایـی و ڕەوشـت و ئاییـن و ئەخـلاق بـۆ خەڵـک بـکات، ئایـا ئـەوە موسـیبەت نیـە؟ هـەر دەبووایە عیبـڕەت وەربگرن لە سـەرۆکی وڵاتـانی ڕۆژ ئـاوا، کـە هێنـدە پێیـان موعجەبـن و پێیـان هـەڵا دەڵێـن، ئەوانـە ئایینـی خۆیانیـان پـێ شـەرم نیـە، ئەوانـە بـاسی خـوا و ڕۆژی دوایـی و دیـن دەکـەن، پۆتیـن جارێـک ئایەتێکـی هێنابـۆوەو، گوتبووی: دەبووایە مسـوڵمانان تەماشـای ئـەم ئایەتە بکـەن! حوکمڕانانی ئـەم وڵاتە، زۆر خراپـە کـە بەرانبـەر بـە ڕابـردووی خۆیان، هەسـت بە شـەرمەزاریی دەکـەن، ئاخـر ڕابـردووی مسـوڵمانانەی ئێمـە چـی تێدایـە، جگە لـە خێرو

چاکە، ئەم میللەتەی ئێمە لە ئیسلامدا جگە لە سەربەرزیی و چاکەو خێر چی دەست کەوتوە؟ هەرکەسێک کە تێیاندا هەڵکەوتوە، لە بواری هونەر و شیعر و ئەدەب، بواری تەزکیەو، خەباتی ڕزگارییخوازیی، هەموویان دەرچووی قوتابخانەی ئیسلامیین، هەموویان دەرچووی حوجرەکانن، هەموویان دەرچووی تەکیەو خانەقاکانن، هەموویان ئەو کەسانە بوون کە بەشیری ئیسلام و دینداریی فرچک دراون.

# تەوەری حەوتەم و کۆتایی

## چوار پرسی گرنگ

**یەکەم:** براو خۆشکە بەڕێزەکانم! ئەندامانی بەڕێزی کۆنگرەی چوارەمی کۆمەڵی ئیسلامیی! پێویستە ئاوڕێکی جیددیی بدەینەوە لە گەنج و لاوەکانمان، ئێمە چ وەک کۆمەڵی ئێستا، چ وەک خەڵکی دیکە کە لە تەوژمی ئیسلامییدایە، ئێمە بەرپرسی یەکەمین بەرانبەر بە گەنج و لاوەکانمان، زۆر حیزبی دیکە ئەوە دیارە، گەنج و لاوی بۆ ئەوەیە تەزویری پێ بکات و، بۆ ئامانجی حیزبیی و سیاسیی ناهەق بەکاری بێنێ، بەڵام ئێمە دەبێ وەک ئەمانەتێک تەماشای منداڵەکانمان، نەوجەوانەکانمان، بە کوڕو کچەوە کە تازە پێ دەگەن، بکەین، ئایندەی هەر کۆمەڵگایەک بەستراوەتەوە بە چینی گەنج و تازە پێگەیشتوویەوە، لە ڕووی فێرکردنیان، لە ڕووی چارەسەرکردنی کێشەکانیان، لە ڕووی ئاسانکاریی کردنیان بۆ ئەوەی هاوسەرگیریی بکەن، بۆ ئەوەی لە ڕووی ئەخلاقیی و ڕەوشتییەوە دانەڕووخێن، هەروەها کۆتایی بهێندرێ بەوەی چیدیکە ئەو خەڵکە ئاڵوودەی بەکارهێنانی ماددە بێهۆشکەرەکان بێ، نەتانبینیوە لە تاران و، لە شوێنە قەرەباڵغەکانی وڵاتانی ڕۆژئاوادا، چۆن خەڵک کەوتووە، ئەوانەی موعتادن و خوو دەگرن بەو ماددە سەرخۆشکەرانەوە، چۆن مێش و مەگەز تێیان دەورووکێ، دەبنە بار بەسەر کۆمەڵگاو بەسەر دەوڵەتیشەوە، ئێمە هەر بۆ خۆمان بارو دۆخەکەمان تەواو نیە،

بۆچی چینێکیش لەوانە بەسەر خۆمانەوە بکەینە سەربار؟!

**دووەم:** هەروەها پێویستە کاری زیاتر بکەین لەو ڕووەوە کە ڕێ تەخت و ئاجووختر بکەین بۆ خوشکانمان، کۆمەڵگا بەبێ تێگەییشتن و پێگەییشتنی ئافرەتان بەرەو پێش ناچێ، کۆمەڵگایەکی دواکەوتوو، پێشی دەبێ تەماشای ئافرەتەکانیان بکەین، ئافرەت کە دواکەوتوو و ناحاڵیی بوو و پەروەردە نەکراو بوو، ئەو وەچەیەش کە پەیدای دەکات، ئەویش هەر پەروەردە نەکراو و ناحاڵیی و دواکەوتوو دەبێ، پێویستە ڕێ تەخت و ئاجووختر بکەین بۆ خوشکانمان و هاوکاریان بین و دەستبارگریان بین و هاندەریان بین، بزانین ئەوانیش وەک پیاوان ئەرکیان لەسەر شانە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ:﴿فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۖ ١٩٥﴾آل عمران.

هەروەها فەرموویەتی:﴿وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ ٧١﴾ التوبة.

لێرەوە دڵسۆزانە بە هەموو برایان دەڵێم: هەرکامێکتان دەستبارگرو هاوکاری هاوسەرو کچ و خوشک و دایکی و خزمەکانی بێ، چونکە ئافرەت، بێگومان پیاو دەتوانێ پەرچی بخاتە بەر دەم و، دەشتوانێ هاوکارو پشتیوانی بێ، هەڵبەتە ئافرەتانیش دەبێ هاوکاری پیاوەکان بن.

**سێیەم:** پرسێکی دیکە ئەوەیە کە زیاتر هەوڵ بدەین گەشە بدەین بە کاری خێرخوازیی خۆمان، کاری خێرخوازیی ئێمە

کـە هەمـوو سـنوورەکاتی تێپەڕانـدوون و، نـە مانبەسـتۆتەوە بـە کۆمەڵـی ئیسـلامییەوە، بەڵکـو سـنووری حیزبیـی تێپەڕانـدوە، لـە خزمـەت خەڵکـی ئـەم وڵاتەدایـە، پێویسـتە زیاتـر پـەرەی پێبدەیـن و، مـن دەستخۆشـییش دەکـەم لـە هەمـوو ناوەندەکانمـان کـە کاری خێرخوازیـی دەکـەن بـە هەمـوو بەشـەکانیانەوە، کـە خەڵکێکـی زۆریـان لـە مەینەتیـی و بـێ خانوویـی و دەردەداریـی و نەخۆشـیی و پـەژارە دەربـاز کـردوە، هەڵبەتـە هـەر بـە پـارەی خێرخـوازان و هاوکارانیـش، خـوا پاداشـتیان بداتـەوە، ئنجـا پێویسـتە ئـەوە زیاتـر گەشـە پـێ بدەیـن و ڕێـک و پێکـتری بکەیـن.

**چـوارەم:** پرسـی چـوارەم و کۆتاییـم ئەوەیـە ،کـە ئێمـە لـە ڕووی بەڕێـوە بـردنی حیـزب و زەبـت و ڕەبتـی حیزبییـەوە، پێویسـتە پێشـکەوتووانەترو گەشـە سـەندووانەتر، کـار بکەیـن و، هـەر شـێوازێک و ئامڕازێـک و فۆڕمێـک بـە کەڵکـی ئێسـتا نایـەت، بـا چـاوی پێـدا بگێڕینـەوەو شـوێنەکەی پڕبکەینەوە، بە شـێوازو ئامڕازو هـۆکارو فۆڕمێکـی باشـترو پێشـکەوتووترو گونجاوتـر لەگـەڵ واقیعـدا، ئـەوە عـادەتی پێغەمبـەر بـووە (علیـە الصلاة والسـلام) عـادەتی چـوار خەلیفـە ڕاشـیدەکانی بـووە «خـوا لێیـان ڕازی بـێ»، کـە هەرگیـز تێـوەڕا نەمـاون چاو چڕ دابگرن لەسـەر هەندێ شـێوازو ئامـڕازو فۆڕمـی تایبـەت و بـە موقەددەسـیان نەزانیـون، ئـەوەی کـە موقـەددەس و پیـرۆزەو نابـێ دەسـتکاریی بکـرێ، بریتیـە لـە وەحیـی خـوای پـەروەردگار، بریتییـە لـە قوڕئـان و سـوننەت و ئامانجـە شـەرعییەکان، بـەڵام شـێوازو ئامـڕازو ڕێبـازەکان، دەبـێ ڕۆژانـەو

بەردەوام، بەپێی پێویست دەستکارییان بکەین.

لە کۆتاییدا دەڵێم: ئێمە پرۆسەیەکی هەڵبژاردنی سەرکردایەتیی ئەو ئەندام سەرکردایەتییانەی کە ماون، لە پێشمانە، لێرەوە دڵسۆزانە بە هەموو لایەک دەڵێم: پێویستە زۆر بابەتییانەو دڵسۆزانە، خوای پەروەردگار بەسەر خۆمانەوە بکەین بە شایەد و کێ پێمان وایە شایستەترو چاکترە، بەبێ تێخوێندنەوەی کە دەیناسی یان نایناسیی، کێیە و چۆنە چۆن نیە، پێشتر پەیوەندییتان بووە یان نا، یان ڕۆژێک تۆی تووڕە کردوە، یان تۆی ڕازی کردوە؟ ئەوانە نابێ تێبخوێنرێنەوە، وەک لە کۆبوونەوەکانیشدا کە بۆ ئەندامانی کۆنگرە بەستمانن، باسمکرد.

هیوادارم چاودێریی خوای پەروەردگار بەسەر خۆمانەوە ببینین و، زۆر بابەتییانەو دڵسۆزانەو بە پەرۆشەوە، بۆ ئایندەی ئەم ڕەوت و تەوژمە ئیسلامییە، ئاوا دەنگ بدەین سەرکردایەتییەکی ئاوا هەڵبژێرین.

لەکۆتاییدا لە خوای پەروەردگار دەپاڕێمەوە کە بە کەرەمی بێ سنووری خۆی، لەسەرجەم ئەو براو خوشکانەمان خۆشبێ، کە یان شەهید بوون، یان بە شێوەیەک لە شێوەکان کۆچی دواییان کردوەو، ئەم کاروانەیان بەجێهێشتوە، ئومێدم وایە خوای پەروەردگار بە پلە بەرزەکانی بەهەشتی گەیاندبن، خوا بە کەرەمی خۆی ئێمەش بەردەوام بکات لەسەر ڕاستە شەقامی خۆی بە ڕاستیی و ساغیی و، بە بێ فێڵیی و بەبێ گریێ و گۆلیی، لەگەڵ خوادا و لەگەڵ خەڵکی خوادا.

کۆتایـی وتارەکەشم بـەو وشـەیە دێنم کـە شـێخ عەبدولقـادری گەیلانیـی دەیگـوت: ئیسـلام لـە دوو وشـەدا خوڵاسـە دەبێتـەوە: (صدق مـع الحـق، و خلـق مـع الخلـق)، (ڕاسـتیی لەگـەڵ خـواداو، ڕەوشـتی جـوان و ئـاکاری پەسـەند لەگـەڵ خەڵکـی خـوا).

٢٠٢١/٠٢/١٨

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

هەموو لایەک بەخێربێن

**الحمد لله وصلى الله تعالى وسلم وبارک على رسول الله محمد وآله المهتدين بهداه، من الصحب والأزواج والقرابة والتابعين لهم بإحسان إلى يوم لقاء الله.**

بەڕێزان! ئێمە لە ڕۆژانی: (١٨-٢٠٢١/٢/١٩) کۆنگرەی چوارەمی کۆمەڵی ئیسلامییان بەست، بێگومان هەرکۆنگریەک کە دەبەسترێ لە لایەن هەر حیزب و ڕێکرخراوێکەوە، هەمیشە کۆنگرەو کۆبوونەوەکان، وێستگەیەکن کە ئەو کۆمەڵە، ئەو خەڵکە تەماشای ڕابردووی خۆیان بکەنەوە، هەر هەڵەو پەڵەو کرچ و کاڵییەکیان هەبێ، چارەسەری بکەن و، سەرنج بدەنە داهاتووش، هەر نەخشەو بەرنامەیەک پێویستبێ بۆ داهاتوو، لەپێناو بەرەو پێشچوون و گەشەکردن دا، بەڕاوێژی هەموو لایەکیان، دایبنێن.

ئێمە ئەم کۆنگرەی چوارەمی کۆمەڵی ئیسلامیی پێشوو و کۆمەڵی دادگەریی ئێستاش، ساڵێک بەسەر وادەی بەستنیدا تێپەڕی بوو، ئەویش بە هۆی بارودۆخی ناجێگیر لە ڕووی تەندروستییەوە لە هەرێمی کوردستان و ناوچەکەشدا، دوای ئەوە کە بۆمان دەرکەوت کە ئەگەر کۆنگرە ببەستین و ئەندامانی کۆنگرە کۆببنەوە، ئومێد وایە کە لە زیانی تەندروستیی دووربن، کۆنگرەکەمان گرێدا.

**ئەم کۆنگرەی چوارەمەش بە سێ قۆناغ بەسترا:**

**قۆناغـــی یەکەم:** کۆبوونەوە گشـــتییەکان بوون، کە نیزیکەی هەشـــت هەزار (٨٠٠٠) لـــە ئەندامانی کۆمەڵ تێیاندا بەشـــدار بوون.

**قۆناغـــی دووەم:** کۆنفرانســـە ناوچەییـــەکان بـــوون، بە مەبەســـتی هەڵبژاردنی بەرپرســـانی مەڵبەندەکان، ئێمـــە دوازدە مەڵبەندمان هەن، یازدەیـــان لە نێـــو هەرێمـــی کوردســـتان و یەکێکیان لـــە هەندەران.

**قۆناغی ســـێیەم:** بریتی بـــوو لە گرێدانی کۆنگرە، لـــەو دوو ڕۆژەدا کە باسمان کردن.

ئێمـــە وەک کۆمـــەڵ هەمیشـــە هەوڵمانداوە بـــە چـــاوی ڕەخنە لە خۆگرتن و تەماشـــای خۆکردن، بـــەوەی کە ئێمـــە کۆمەڵێک مرۆڤین، دەگونجـــێ کەم و کووڕیـــی و کـــرچ و کاڵییمان هەبێ، بـــەو چاوەوە تەماشـــای خۆمانمان کردوە.

بۆیە لەم کۆنگرەیـــەدا زۆر ئازادانەو سەربەســـتانە، هەموو ئەندامان لە برایان و خوشـــکان قســـەی خۆیانیان کرد.

ئەوەی کە بـــە پێویســـتی دەزانم لێـــرەدا هەڵوەســـتەی لەبەردەمدا بکـــەم، بریتیە لەوەی کە ئێمـــە هەمواری پەیـــڕەوی نێوخۆمان کردەوە، هەڵبەتـــە دوای ئەوەی کەسی یەکەمی کۆمەڵ هەڵبژێـــردرا، دوایی ئێمە هەمـــواری پەیڕەوی نێوخۆمـــان کردەوە، لە نێو پەیـــڕەوی نێو خۆدا، ناو و نیشـــانی کۆمەڵمان گۆڕی، لـــە کۆمەڵی ئیســـلامییەوە بۆ (کۆمەڵی دادگەریـــی)، هەروەها ناوی کەســـی یەکەم گۆڕدرا لـــە (ئەمیر)ەوە بۆ (ســـەرۆک)، هەروەها ئاڵای کۆمەڵیش لەســـەر ڕاسپاردنی کۆمسیۆنی

باڵای هەڵبـــژاردەکان لە حکوومـــەتی نێوەندیی، ئەویـــش گۆڕانێکی بەســـەردا دێ، بـــەڵام ڕەنگەکەی وەک خـــۆی دەمێنێتـــەوە، هەروەها لـــە کۆمەڵێك بڕگـــەی دیکـــەدا گۆڕانکارییمان کرد، یەکێـــک لەوانە ئێمە ڕێژەی بەشـــداریی ئافرەتانمان لە ســـەرکردایەتییدا لە (١٠%)ەوە هەڵکشـــاند بۆ (٢٠%) ئەوەش نیشـــانەی ئەوەیە کە لـــە کۆمەڵدا ڕۆژ بەڕۆژ ئافرەتـــانی بەتواناترمان تێدا هەڵدەکەون، کە شایســـتەی ئەوەن ئەوانیـــش ئەرک و کارو بەرپرســـیارێتیی شـــان بە شـــانی برایانیان هەڵبگرن، چوار خوشـــک هاتنە نێو ســـەرکردایەتیی، کـــە تەنیا برایان بۆ بەرپرسی مەڵبەنـــدەکان دانـــراون، کەواتە: لـــە (٢٢) کەس، چوار ئافـــرەت هاتنە نێو ســـەرکردایەتیی و بە دەنگـــی خۆیان هاتن.

یەکێک لـــەو بابەتانە بە پێویســـتی دەزانم بە تایبەت و تیشـــکێکی بخەمـــە ســـەر، گۆڕینی ناو و نیشـــانی کۆمـــەڵ بوو لـــە: (کۆمەڵی ئیســـلامیی)ی‌ەوە بـــۆ (کۆمەڵی دادگەریـــی)، کە ئـــەوە کاردانەوەی جیاوازیی بەدوای خۆیـــدا هێناو، ئەوەی من تێبینییـــم کردوە، زۆربەی خەڵـــک پێی وابووە، ئـــەوە هەنگاوێکە بـــۆ خۆ تازەکردنـــەوەو بەرەو پێشـــچوون و خۆ فراوان کردن و، هەر ئەو نیەتەشـــی لە پشتەوە بووە، ڕەنگـــە کەمێك جۆرێـــک لە نیگەرانییـــان بۆ دروســـت بووبێ، بەڵام بێگومان ئێمـــە ناو و نیشـــانمان گۆڕیوە و نێوەڕۆکـــمان نەگۆڕیوە و، لە ڕاســـییتدا نێوەڕۆک بەو واتایەی ئێمە کارو کاروانی ئیســـلامیین و پابەندین بە ئیســـلام و قوڕئان و ســـوننەتەوە، بێگومـــان نێوەڕۆک وەک خۆیـــەتی، بەڵکو هـــەوڵ دەدەین ئێمە پابەندییمان بە شـــەریعەت زیاتـــر بکەین، چ لە بـــواری بووناســـیی و تێڕوانیـــن و، چ لە بواری

ئیمان و عەقیدەو چ لە بواری پەرستشـــەکان و ڕەوشـــت و ئاکارەکاندا و چ لە بواری هەڵوێســـتە سیاسییەکاندا.

لێرەشـــەوە دەمەوێ ڕایبگەیەنم: کە هەندێك کـــەس وا دەزانن ئەگەر بتـــەوێ بکرێیەوە بە ڕووی کۆمەڵـــگاداو، باخەڵی خۆت فەڕاحتربکەی و، ســـێبەری خۆت فراوانتربکـــەی، دەبێ دووریی بگری لە ئیســـلام!! بەڵام بێگومـــان بە پێچەوانـــەوە: ئەگـــەر ئێمە لە ئیســـلام تێبگەین، وەک ئەو شـــەریعەتەی لە قوڕئان و ســـوننەتدا بەرجەستەیە، ئێمە هەتا باشـــتر لە قوڕئان و لە ڕێبـــازی پێغەمبەر (علیه الصلاة والســـلام) کە شـــەریعەت لە هەردووکیان پێکـــدێ تێبگەین، ئنجـــا دەزانین کە ئەو شـــەریعەتە زیاتر فەرمانمـــان پێ دەکات بە کرانەوەو ســـەماحەت و بە تەبایـــی و بە پێکەوە ژیان، هەروەها شـــەریعەت زیاتـــر فەرمانمان پێ دەکات بـــە لە خەندەک و لە ســـەنگەری مەزلوماندا بوون و وەســـتان لەبەرانبەری ســـتەمکارن و قۆرخـــکاران و گەندەڵکارانـــدا، هەروەها شـــەریعەت فەرمانمان پێ دەکات بە زیاتر خۆ ڕازاندنەوە بە ڕەوشـــتە بەرزو جوانـــەکان و، خۆ بژاردن لـــە خوو و خدە خراپـــەکان، هەروەها شـــەریعەت زیاتر فەرمانمـــان پێ دەکات بـــە کارئاســـانیی کردن بۆ کۆی پێکهاتـــەکانی کۆمەڵگا، بەتایبەت ئافرەتان، هەروەها شـــەریعەت فەرمانمان پـــێ دەکات بـــە هەرچی زیاتر کار لەســـەر خۆکـــردن، لە ڕووی زانســـتیی و عەقڵ و هۆشـــەوە، لـــە قوڕئاندا لە پەنجا شـــوێن زیاتـــر، خوا دەفەرمـــوێ: ئەم قوڕئانـــە لەلایەن خـــواوە دابەزێنراوە بۆ کەســـانێ بفامن و تێبگەن و بیربکەنەوە.

بەچەند ئامانجێکیـــش ئەو گۆڕانگارییەمان کردوە لە ناو و نیشـــاندا، هەروەها لە ناوی کەســـی یەکەمدا:

١. کـە ئێمـە دانەبڕیـن لـە خەڵـک و کۆمەڵـگای خۆمـان، خۆمـان لـە خەڵکـە مسـوڵمانەکەمان جیـا نەکەینـەوە و، خۆمـان لـە سـتەمکار و گەندەڵـکاران جیابکەینـەوە، لـە ڕابـردوودا کـە نـاوی کۆمەڵـی ئیســـلامییمان لـــە خۆمـــان نـــاوە، دیـــارە هـــەل و مەرجەکـــە وای خواسـتوە، ئێسـتاش هـەل و مـەرج گـۆڕاوە، زانایەکـی پایەبـەرزی وەک (القـرافي) لـە کتبێکـی دا بـە نـاوی: (الإحـکام في تمییـز الفتـاوای عـن الأحـکام وتصرفـات القـاضي والإمـام) دەڵـێ: ئـەو فەتـواو حوکمـە شـەرعییانەی لەسـەر عـورف و نەرێتێـک بنیـات دەنرێـن، هەرکاتێـک عـورف و بـاو و نەرێتەکـە گـۆڕا، دەبـێ ئـەو حوکمانــە بگۆڕێـن.

ئێمە کاتی خۆی ئـــەو ناوەمان لەخۆمان ناوە، هـــەل و مەرجێکی تایبەت بـــووە، ئێســـتاش هـــەل و مەرجەکە گـــۆڕاوە، ناوێکی دیکەمـــان لەخۆمان نـــاوە، بێگومان لە ئیســـلامدا ناو و نیشـــان جێی ســـەرنج و عیبـــڕەت نیە، بەڵکـــو نێوەڕۆک جێـــی عیبڕەتە: (العـــبرة بالمحتویات والمضامین ولیســـت بالأســـماء والعناوین).

٢- ئێمـــەش کـــە پاشـــگری (ئیســـلامیی)مان لا بردوەو پاشـــگری (دادگەریی)مان لەشـــوێن داناوە، ئەوەمان کردوە بەناوونیيشـــان کە خـــوای گەورە دادگـــەر کردوویەتـــی بە ئامانجـــی نێردرانی ســـەرجەم پێغەمبەرانـــی "عليهم السلام" وەک خـــوا «ســـبحانه وتعالی»

دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ ۝٢٥﴾ الحديد.

واتە: پێغەمبەرانمان هەموویان بە بەڵگە ڕۆشنەکانەوە ناردوون و، کتێب و تەرازووشمان لەگەڵ دابەزاندوون تاکو خەڵک بە دادگەریی بەڕێوە بچن.

دادگەریی لە ڕووی: نەتەوەیی و سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتییەوەو لە هەموو کایەکانی ژیاندا، هەموو پێغەمبەران "عليهم السلام" هاتوون دادگەریی بچەسپێنن، وەک مامەڵەی مرۆڤەکان لە نێو خۆیانداو، هاتوون خوا بەیەکگرتن(توحید) بچەسپێنن ،وەک مامەڵەی مرۆڤەکان لە خزمەتی خوادا، وەک خوا دەفەرموێ:﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ ۝٢٥﴾ الأنبياء.

واتە: لە پێش تۆدا هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە، مەگەر پێمان ڕاگەیاندوەو وەحییمان بۆ ناردوە، کە جگە لە من هیچ پەرستراوی دیکە نین، تەنیا بەندایەتیی بۆ من بکەن.

٣. هەروەها ئێمە ویستمان بەو گۆڕانکارییەی کە کردمان، ترس و سڵەمینەوەی کەسانێک لەخۆمان بڕەوێنینەوە و، باجدانی بێ جێ لە کۆڵ خۆمان بکەینەوە، چونکە کۆمەڵێک لایەنی ئیسلامیی هەن لە هەندێ لە وڵاتانی ئیسلامییدا، کە ئەو پاشگرەیان هەیەو، هەندێک هەڵوێست و کردەوەیان هەن، کە لە شەریعەتدا جێیان نابێتەوە، ئنجا ئێمە بۆچی بەهۆی ئەو پاشگرەوە باجی هەڵەی ئەوانە بدەین، یاخود بۆچی دۆسیەی خۆمان لەگەڵ دۆسیەی ئەواندا تێکەڵ بکەین؟!

٤. هەروەها ئەو گۆڕانکارییەی کردوومانە، مەبەستمان ئەوەبووە کە ببێتە پردێک بۆ زیاتر لەیەك نیزیک بوونەوە لەگەڵ هەموو پێکهاتەکانی کۆمەڵگادا، هەموو ئەوانەی کە دەیانەوێ دادگەریی بچەسپێ لە وڵاتەدا، زوڵم و ستەم و گەندەڵی نەهێڵرێت، با ئەوانە هەموویان بێن، پێکەوە دەسبارگرو هاوکاربین.

ئێمە هەرکەس نوێژی بەکۆمەڵمان لەگەڵ دەکات، زۆرباشە و، کەسێک نوێژی بەکۆمەڵ ناکات، بابێ بە کۆمەڵ و بە دەستە جەمعیی دادگەریی بچەسپێنین، زوڵم و ستەم و قۆرخکاریی و گەندەڵکاریی لابەرین، کە بێگومان بە دادگەریی وڵات بۆ هەموو لایەک فراوان دەبێ و، بە زوڵم و ستەم، مرۆڤماڵی خۆشی لێ وەتەنگ دێ، وەک عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب "خوا لێی ڕازی بێ" زۆر جوانی گوتوە:

**(ومن ضاق به العدل فالجَوْر عليه أضيق)**

واتە: هەرکەسێک بە دادگەریی سەغڵەت بێ، بە زوڵم سەغڵەتتر دەبێ.

بە تەئکید بە دادگەریی سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتیی، وڵات فراوان دەبێ و بەرەکەت دەکەوێتە وڵاتەوە، بەڵام بە زوڵم و ستەم و قۆرخکاریی و چینایەتیی و قڕیی و پڕیی، هەموو کەس وەزعی تێک دەچێ، خوا "سبحانه وتعالى» لە قورئاندا زۆر بە ڕوونیی ڕایگەیاندوە کە زوڵم و ستەم، دەبێتە هۆی لە بێخ هەڵکەندن و کۆتایی پێ هێنانی کۆمەڵگایەکان، وەک دەفەرموێ:﴿وَكَمۡ قَصَمۡنَا مِن قَرۡيَةٖ كَانَتۡ ظَالِمَةٗ ﴿١١﴾﴾ الأنبياء. واتە: زۆر ئاوەدانییمان لە بەین بردن، چونکە خەڵکەکەیان ستەمکاربوون، هەروەها دەفەرموێ:﴿وَمَا كُنَّا مُهۡلِكِي ٱلۡقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهۡلُهَا ظَٰلِمُونَ ﴿٥٩﴾﴾ **القصص**. واتە: ئێمە ئاوەدانییەکان، وڵاتەکان لە بەین

نابەین، مەگەر خەڵکەکەیان ستەمکاربێ.

ئومێدمان وایە ئەو گۆڕانکارییەی کە کردوومانە، دەروازەیەک بێ بۆ زیاتر نیزیک بوونەوە لە هەموو لایەنە سیاسییەکان و لە کۆی پێکهاتەکان، بە تایبەت لەو کەسانەی کە چاوەڕێی ئەوەن دادگەریی لەم وڵاتەدا زیاتر بچەسپێ و، زوڵم و ستەم و قۆرخکاریی و گەندەڵیی کۆتایی پێ بێ، کە بێگومان خوا ئەم وڵاتەی داناوە و ئەو بژێو و ڕۆزییەی تێیدا داناوە، بۆ هەمووانی داناوە، نەک بۆ چەند کەس و چەند ماڵێک، نەک بۆ چەند حیزبێک، بەڵکو خوا بۆ هەمووان نیعمەتەکانی داناون، بۆیە حاڵەتی شەرعیی و حاڵەتی لۆژیکیی ئەوەیە هەموو هاووڵاتییانی وڵاتێک، لە نیعمەت و خێرو بێرەکانی ئەو وڵاتەدا بەهرەمەند بن، ئا ئەوەش دادگەرییە و، ئا ئەوەیە کە پێویستە هەموومان هەوڵ بدەین بۆ چەسپاندنی.

هەڵبەتە دادگەریی، وێڕای ڕەهەندی ماددیی و ئابووریی، ڕەهەندی ئاکاریی و مەعنەوییش دەگرێتەوە و، ڕەهەندی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و، هەموو ڕەهەندەکان دەگرێتەوە، بە هیوای ئەوەی بەهەموو لایەک بتوانین هەرچی زیاتر دادگەریی لە وڵاتی خۆماندا بچەسپێنین، کە بێگومان هەموومان لە سایەی و سێبەری دادگەرییدا، بەهرەمەند دەبین و، هەمووشمان ئێستاکە لە زوڵم و ستەم زەرەرمەندین، بەر لە هەموو کەس ئەوانەی ستەم دەکەن، لەو زوڵمەکەی خۆیان زەرەر مەندن و عەیبداری دنیا و گوناهباری قیامەتن

**ئەمە کورتەو خولاسەی ئەوە بوو کە ویستم ئاراستەی دەزگاکانی ڕاگەیاندنی بکەم.**

## ١. هەژار ئەنوەر لە سایتی شار پرێس:

**پرسـیاری یەکـەم:** قسـەی مامۆسـتا عەلـی باپیر چیە لەسـەر سـزادرانی پێنـج ڕۆژنامەنـووس وچالاکوان بەشـەش سـاڵ زیندانیی؟

**پرسـیاری دووەم:** بۆچـی لەکۆبوونەوەکانی نێوان هەرێـم و بەغدادا، کەسـی یەکەمی لایەنـەکان ناچنـە بەغدا؟

## مامۆستا عەلی باپیر:

**وەڵامـی پرسـیاری یەکـەم:** سـەپاندنی سـزای شـەش سـاڵ زیندانیـی کـردن، بەسـەر هەرکەسێکدا، ئەگـەر بـە دادگایـی کردنێکـی عادیلانـەو ڕۆشـنبێ و، ئـەو کەسـەی کـە تۆمەتبارکـراوەو سـزا دراوە، ڕاسـت بـێ تاوانەکـەی کردبـێ، - ئـەو تاوانـەی ئـەو سـزایەی شایسـتەیە - ئـەوە بێگومـان کـەس گلەیـی نیـە، بـەڵام بـە پێـی زانیاریـی مـن، وانیـە، بەداخـەوە لـەم وڵاتـەدا هەندێک لـە ئەندامانی ئێمـە، دوای چەندین سـاڵ لـە دەسـتگیرکرانیان بە ناحەق، لە سـجن هاتوونە دەرو بۆیـان گێڕاوەمەوە کـە هەبـووە بـەزۆر ئیعیتڕافیـان پێ کردوە، بە هەڕەشـە لێکـردن و هەبووە گەیاندوویانەتـە ئاقـاری مـردن، ئنجـا گوتوویـەتی: چیتـان لێـم دەوێ، گوتوویانـە: ئەوەمـان بـۆ ئیمـزا بکـە، گوتوویـەتی: هەرچـی بێنـن ئیمزای دەکـەم! ئـەوە بـە تەئکیـد بەپێـی شـەریعەت و بـە پێـی عەقـڵ و مەنتیق و بـە پێـی یاسـا نێـو دەوڵەتییـەکان، ئیعتیـڕاف و پـێ لێنانێـک بـە زۆر وەرگیرابـێ، هیـچ ئیعتیبارێکی پێ ناکـرێ، ئنجا ئەگەر ئـەو دادگاییکردنە ،بینا لەسـەر ئیعتیڕاف و دانپێداهێنانی بەزۆربێ، بێگومان هیچ ئیعتباری نیـە، مـن پێموایـە ئـەوەی پاکبێ بـێ باکە، بـۆ حورمـەت و ئیعتبـاری ئەم

قـەوارە سیاسـییەی ئێمـە، بـە دەسـتەڵاتی دادوەرییـەوەو بـە پەرلەمـان و بـە حکوومەتیشـییەوە، وا باشـترە کەسـێک خەتایـەک دەکات، بهێـنرێ خـۆی پـێ لـە هەڵەکـەی خـۆی بنـێ و، ڕێـگای بدەن خۆی قسـە بـکات و پارێـزەری هەبـێ، بـەڵام کەسـێک کـە ماوەیەکـی زۆر نازانـرێ چـی لـێ هاتـوەو، دوایـی سـەدو یـەک پرسـیار لەسـەر چۆنییـەتی حوکمدانەکەی هەبـێ، بێگومـان حورمـەت و ئیعتیبـاری ئـەم قـەوارە سیاسـییەی ئێمـە، زیاتـر دەکەوێتـە ژێـر نیشـانەی پرسـیار، ئێمـە و هەموو لایەکیـش دەبێ دڵسـۆزبین بـۆ خۆمـان و بـۆ قەوارەکەمـان و، هەرچـی زیاتـر نیشـانەی پرسـیاری لـێ دووربخەینـەوە، هەرچـی زیاتـر عەیـب و عـاری لـێ دووربخەینـەوە.

**وەڵامـی پرسـیاری دووەم:** بەڵـێ ڕاسـتە، پێـم وایـە هـۆکاری سـەرەکیی نەگەیشـتنە ئەنجـام لەکۆبوونەوەکان دا، ئەوەیە کە کەسـانی یەکەم ناچن بـۆ بەغـدا، کاتی خـۆی من چوار سـاڵم لـەوێ گوزەراند، لـە ئەنجوومەنی نوێنـەران بـووم، ناچـار دەبـووم لەوێوە قسـە بکـەم و لەگـەڵ جەنابی مام جـەلال و جەنابـی کاک مەسـعوود، جەنابـی کاک نەوشـیروان، کـە ئـەو نوێنەرانەتـان کـە لێـرەن، فلان پرسـەیان بـۆ یەکلایـی نابێتـەوە! بێگومان وا باشـترە کـە کەسـی یەکەمـی لایەنـەکان ئامادەبـن، بەتایبـەتی ئێسـتا بـۆ موفـاوەزات و بـۆ چارەسـەری کێشـەکە کـە گەیشـتوەتە کۆتایـی، بێگومـان کـێ بەهێزتـرەو کێ یەکلایـی کردنـەوەی بڕیارەکەی بەدەسـتە، ئـەو دەبـێ بچـێ، ئەگەرنا پێچەوانـەی عەقـڵ و لۆژیکە کەسـێک بنێری دەسـت بەسـتراو بـێ و، هەمـوو جـارێ ناچار بـێ تەلەفـۆن بـکات، بزانێ چـی بـکات و چـی بڵێ؟!

## ٢. مصطفى جلال له دامەزراوەی میدیایی (خەندان):

**پرســـیاری یەکەم:** دەگوترێ لـــە کۆنفرانسی مەڵبەنـــدەکانی کۆمەڵی ئیســـلامیی دا، بـــە زۆرینەی دەنـــگ نارازیی بوونە لە ســـەر بابەتی گۆڕانی پاشـــگری ئیســـلامیی، بەڵام دواتر لە کۆنگرەکـــەدا بڕیاردرا کە ناوەکـــە بگۆڕدرێ؟

**پرســـیاری دووەم:** زۆرینـــەی ئەندامـــان نارازییـــن لـــە بڕیارەکانی کۆنگـــرەی چـــوارەم، ئێـــوە بەڕێزتـــان پەیامتان چیـــە بۆیان؟

## مامۆستا عەلی باپیر:

**وەڵامـی پرسیاری یەکەم:** ئەوە ڕاسـتە کە لـە کۆنفڕاسـە ناوچەییەکان دا گۆڕینـی ناوونیشـان دەنگـی نەهێنـاوە، بـەڵام بەنـدە ئـەو بیرۆکەیـەم هەبـوو، نـەک ئێسـتاش، لـە کۆنگـرەی پێشووشـدا هـەر هەمبـوو، بـەڵام لـە کۆنگـرەی پێشـوودا هەنـدێ شـتمان خسـتە دەنگـەوە، نـەک گۆڕینـی نـاو و نیشـانی حیـزب، بەڵکـو ناوونیشـانی کەسـی یەکـەم و هەنـدێ شـتی دیکەمـان خسـتە دەنگـەوە، دەنگـی نەهێنـا، ئەمجارەش لـەم کۆنگـرەی چوارەمـەدا، گوتـم لـە یادتانـە لـە کۆنگـرەی سـێیەمدا، هەندێ شـتم پێشـنیارکرد دەنگـی نەهێنـا، خۆیشـم زویـر نەکـرد، گوتیـان: بەڵـێ، ئنجـا ڕاسـتە لـە کۆنفراسـەکاندا ئـەو ڕایـە دەنگـی نەهێنـا، بەڵام مـن ئەو بیرۆکەیـەم هەبـوو، بەسـەرکردایەتییم گـوت، وەک ئەندامێکـی کۆنگـرە، هەرچەنـد لەو کاتەدا پێشـنیارەکەم کرد وەک سـەرۆکی کۆمەڵیش، بەڵام گوتـم وەک ئەندامێکی کۆنگـرە حەقی خۆمە، منیش پێشـنیارێکم هەیە و دەیکـەم، ئیـدی کـە پێشـنیارەکەم کـرد زۆربـەی هـەرە زۆر دەنگیـان پێـدا.

**وەڵامـــی پرســـیاری دووەم:** ئـــەوەش ڕاســـت نیـــە کـــە دەگوترێ، زۆربـــەی ناڕازیی بـــوون بەڵکو (٥٥٣) کەس، لەوانـــەی کە لەوکاتەدا هۆڵەکـــەدا بـــوو، کـــە دەوری (٧٠٠) کـــەس دەبـــوون، (١٢٣) کەس موعاریزبـــوون، بـــەڵام (٥٥٣) کەس ڕایـــان لەگەڵدا بـــوو و دەنگیان بـــە پێشـــنیارەکەی بەنـــدە دا، هەندێـــک جۆرێک لـــە نیگەرانیی و هەســـتیارییان هەیە و، ئەوەش شـــتێکی مەنتیقییە و شتێکی چاوەڕوان کـــراوە، هەر گۆڕانکارییەک کە دەبێ، ئاســـاییە هەندێـــک پێیان باش نەبـــێ، ئێمە هەڵوێســـتی ئەوانیشـــمان بەڕێزو حورمەتـــەوە وەرگرتوە، ئەوانیش هەر براو خوشـــکی خۆمانن و دڵســـۆزن، بـــەڵام میکانیزمی یەکلاییکردنـــەوەی بڕیـــارەکان لـــە لای ئێمە بە زۆرینـــەو کەمینەیە، زۆرینـــە ڕایان لەگەڵـــدا بـــوو، زۆرینـــەی ئەندامانی کۆنگـــرە، کە ئەندامانی کۆنگرە لـــە کۆنفڕاسەکانیشـــەوە هاتوون، لە کۆنگرەشـــدا هەموو بەرپرســـیارێتییەکان ســـفر دەبنەوە، هەموو ئاســـتەکان ســـفر دەبنـــەوە، بۆیـــە کاتێک کە پێشـــنیارێک بـــاس دەکرێ لـــە بارەی هەر شـــتێکەوە و، پێشـــنیارەکە قبـــووڵ دەکرێ لە لایـــەن زۆرینەوە، پێشـــنیارەکە شـــوێنی خۆی دەگرێ و بـــە هی هەمـــووان دادەنرێ.

## ٣. ڕەنجە جەمال لە تۆڕی میدیایی ڕووداو:

**پرسیاری یەکەم:** بەم دواییانە پێشکەوتنێکی باش لە پەیوەندیی نێوان کۆمەڵی دادگەریی و یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا هەبوو، باس لەوە دەکرێ کە هەوڵ هەیە بۆ پێکهێنانی هاوپەیمانێتیی بۆ هەڵبژاردنی داهاتووی عێراق لە نێوان هەردوو لایەن، ئەم هەوڵانە بەکوێ گەیشتوون؟ لەوێشەوە بۆ دروستکردنی هاوپەیمانی لەگەڵ چەند لایەنێکی عێراقیی بەتایبەتی چەند لایەنێکی شیعە؟

**پرسیاری دووەم:** باس لەوە دەکرێ کە ئەو هاوپەیمانییەی کە لە ماوەی نیزیکی ڕابردوو لە بەغدا پێک هێنرا، هاوپەیمانی هیوا، بە هەمان شێوە درێژەی پێ بدرێ بۆ هەڵبژاردنی داهاتووی عێراق، هەمان هاوپەیمانی لە نێوان ئەم لایەن و کەسانە هەبێتن، قسەتان لەم بارەیەوە چیە؟

## مامۆستا عەلی باپیر:

**وەڵامی پرسیاری یەکەم:** ئەوەی تا ئێستا ئێمە پێی گەیشتووین، ئەوەیە کە قسەمان کردوە، لەگەڵ هەندێک لایەندا، بەڵام خۆش بەختانە ماوەی دروستکردنی هاوپەیمانییەکان درێژ کرایەوە تاکو مانگی پێنج و، ئێمە دەرفەتی زیاترمان بەدەستەوەیە، بەڵام تاکو ئێستا ئێمە نەگەیشتووینە ئەنجامێکی یەکلاییکەرەوە، لە بارەی هاوپەیمانێتییەوە زیاتر قسە لە نێوان کۆمەڵ و یەکگرتوودا کراوە و، دەگونجێ لەگەڵ هەر لایەنێکی دیکەشدا بکرێ، دوای ئەوەی دەگەڕێینەوە بۆ کادیران و ئەندامانی خۆمان و ئەوە شتێکی واریدە، بەڵام لەگەڵ یەکێتیدا

شـتێک بڕیـار درابـێ، نەخێر ئـەوە ڕاسـت نیە.

**وەڵامـی پرسـیاری دووەم:** بەنیسـبەت هاوپەیمانیـی هیـواوە، پێـم وانیـە ئـەوە ڕێـک بکـەوێ و بگونجـێ، ئـەو هاوپەیمانیەتییـە جێگـرەوەی هەمـوو ئـەو لایەنـە سیاسـییانەبێ کـە پێکیـان هێنـاوە، بـەڵام ئـەوە زیاتر بـۆ کاری بەغدایـەو، بـۆ ئەوەیـە کـە لەگـەڵ ڕێزمـدا ئەوانـەی لـە لایـەن پارتیـی و یەکێتییـەوە گوێیـان بـۆ نەگیـراوەو بایەخیـان پـێ نـەدراوەو بیـرو ڕایەکانیـان وەرنەگیـراون، ئەوانـە بۆ خۆیان سـەریان پێکـەوە ناوەو بۆچوونێکـی خۆیانیـان هەیـەو، پێشـنیارو هەڵوێسـتی خۆیانیـان هەیـە، حەقـی خۆشـیانە، بەڵکو هەرکەسـێک بـە تەنیاش حەقی خۆیـەتی چ جای پـازدە پەرلەمانتـار کۆببنـەوە بەڕەنگـی جیـا جیـاو بـە ئینتیمـای جیـا جیـا.

## ٤. زریان تەها لە سایتی وشە:

**پرســـیاری یەکەم:** باســـت لە باجدان کرد لە کۆمەڵی ئیســـلامیی بە هۆی پاشـــگری ئیســـلامیی، کەس هەبووە لە ڕابردوو بەهۆی پاشگری ئیســـلامیی باجی دابێت لە کۆمەڵ؟

**پرســـیاری دووەم:** ئێـــوە وەک کۆمەڵـــی دادگەریـــی، پشـــتگیریی هاوپەیمانیـــی هیوا دەکـــەن لـــە هەڵبـــژاردنی داهاتوو؟

## مامۆستا عەلی باپیر:

**پرســـیاری دووەمـــم وەڵام دایەوە،** کـــە هاوپەیمانیی هیـــوا زیاتر بۆ ئەنجوومەنـــی نوێنەرانەو، نەشـــمزانیوە لایەنە سیاســـییەکان موافیق بن کە هاوپەیمانیی هیـــوا خۆیان وەک ئەلتەرناتیفـــی حیزبەکان، تەرح بکەن.

**وەڵامی پرســـیاری یەکـــەم:** ئایا کەس باجـــی داوە؟ ئێمـــە بێگومان کەســـانێک گیـــراون کاتی خـــۆی، هـــەر بـــە تۆمەتی ئـــەوەی کە ئیســـلامیین، من ئەندامێکی خۆمـــان، کە لە لایـــەن یەکێک لەو دوو حیزبانەی کە ئـــەم وڵاتە بەڕێوە دەبـــەن، گیرابوو، هاتـــەوە دوایی کە گیرابـــوو، ئەشـــکەنجە درابوو، چەند ســـاڵێک لە زینـــدان مایەوە،

- گوتم: تۆ تۆمەتت چی بوو؟!

» گوتی: کە گرتیانم هەر دەمگوت: تۆمەتم چییە و چیم کردوە؟!

٥ گوتیـــان: تۆ لـــە مزگـــەوت زۆر ماویـــەوە و نوێژی ســـوننەتت کـــردوون، پێش فـــەڕزەکان و دوای فـــەڕزەکان!

» گوتم: ئایا ئەوە ڕێ پێدراو نیە؟

گوتیان: با، بەڵام ئایا نازانی لە لای ئێمە بنچینەیەکمان داناوە!

» گوتم: بنچینەکە چیە؟!

گوتیان: بنچنەکە ئەوەیە: نوێژی کەمتر سەلامەتیی زیاتر.

بەڵێ ئێمە باجی ئەوەمانداوە، بەڵام ئێمە لەبەر ئەوەی لێرە باج دەدەین لەسەر ئیسلامیی بوونی خۆمان، ئەو پاشگرەمان لانەبردوە، بەڵکو لەبەر ئەو حیکمەتانەی کە باسمکردن، ئەگەرنا، کەسێک مسوڵمانبێت، دەبێ ئامادەبێ هەموو باجێک بدات لەسەر مسوڵمانێتی خۆی، هەڵبەتە من حەز دەکەم و پێمخۆشە حوکمڕانانی ئەم وڵاتە، ماڵ لە ماڵ خۆ حەڕام نەکەن، لە نێو میللەتێکی مسوڵماندا، نابێ شوێنکەوتنی ئیسلام و نوێژو تاعەت و چاکەکاریی و ڕوو لە خوا کردن، قەدەغە بکرێ و، پێچەوانەی ئەوانە ڕەوا بکرێ، چونکە دڵنیابن میللەتێک گەنج و لاوەکانی بە کوڕو کچەوە ڕوو لە خوابن و هامووشۆی مزگەوت بکەن و، پابەندبن بە شەریعەتەوە، لە هەموو ڕوویێکەوە سەلامەتتر دەبن، لە ڕووی تەندروستیی و ئەخلاقیی و، لە ڕووی دنیاو قیامەتەوە، بەڵام کۆمەڵگایەک گەنجەکانی بەرەو هەڵدێری عادەتی خراپ و تلیاک و نێرگەلە کێشان بچن، کۆمەڵگایەک گەنجەکانی وابن، ئومێدی خێری لێ ناکرێ.

## ٥. بڕیار محمد له دەزگای ستاندەر:

**پرسیاری یەکەم:** لە ماوەی ڕابردوودا چەند هەوڵێک هەبوو لە نێوان کۆمەڵی دادگەریی و یەکگرتووی ئیسلامیی‌دا، بۆ ئەوەی لە هەڵبژاردنەکانی داهاتوودا بەیەک لیست بەشداریی لە پرۆسەی هەڵبژاردنەکان بکەن؟

**پرسیاری دووەم:** لە ماوەی ڕابردوودا نێوان ئێوەو پارتی دیموکراتی کوردستان گرژیی تێکەوتبوو، دوای بەستنی کۆنگرە ئەو گرژییە هەر بەردەوامی هەیە، یاخود پەیوەندییەکانتان تا ئاستێک ئاسایی بۆتەوە؟

## مامۆستاعەلی باپیر:

**وەڵامی پرسیاری یەکەم:** ئێمە لەگەڵ یەکگرتووی ئیسلامیی دا ، ڕاستە قسەو باسمان بووەو ئێستاش قسەو باس هەر هەیە، مادام ماوەکەشی درێژکراوەتەوە، دەتوانین بە نەفەسی درێژتر قسە لەو بارەوە بکەین.

**وەڵامی پرسیاری دووەم:** بۆ پەیوەندییمان لەگەڵ پارتیی، ئێمە پێمان وایە لە لایەن پارتییەوە ڕەنگە بارگرژییەکە دروست کرابێ، ئەگەرنا ئێمە هەر لە شوێنی خۆمانین و، لە یەک مەسافەوە وەستاوین لەگەڵ هەموو لایەنە سیاسییەکاندا، بەڵام دوای ئەوەی کۆنگرەمان گرێدا، لە هەموو ئاستەکانی پارتیی دا پیرۆزباییمان لێکرا: جەنابی کاک مەسعوود بارزانیی و، کاك نیچرڤان بارزانیی سەرۆکی هەرێم و، کاك مەسروور بارزانیی سەرۆکی حکوومەت و،

کاک فازڵ میرانیی و، هتد...
هەروەها سەرجەم لایەنە سیاسییەکانی دیکەش هەموویان، هەروەها لایەنە عێراقییەکانیش زۆریان پیرۆزباییان لێ کردین، بێگومان ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوە کە پەیوەندییەکە ئاسایی بێتەوە، ئێمە بەڵێ ئۆپۆزسیۆنین، بەڵام ئێمە دوژمنی حکوومەت نین، زۆر جار گوتوومانە، ئێمە ئۆپۆزسیۆنین، واتە ڕەخنەی دڵسۆزانەو، بنیاتنەرانە دەگرین و، دەمانەوێ حکوومەت لە ستەم و کەم و کووڕیی و گەندەڵیی دووربێ، دەمانەوێ کە حورمەت و ئیعتیباری ئەم قەوارە سیاسییەمان زیاتر پارێزراوبێ، ئومێدم وایە کە هەمووان بەو ئاڕاستەیەدا بڕۆین، هەمووشمان بێگومان بۆ ئەم وڵاتە پێویستین و هیچ کەسمان لێ زیاد نیە، بەتایبەت لەم ڕۆژگاری پڕ قەیراناویی و پڕ تەحەدییاتەی کە هەرێمەکەمان ڕووبەڕووی دەبێتەوە، زیاتر پێویستیمان بە لەیەک نیزیکیی و تەبایی و دەستبار بۆ یەکدیی گرتن هەیە.

## ٦. ئیدریس موحەممەد کەناڵی ئاسمانیی پەیام:

**پرسیاری یەکەم:** لەناو هۆڵی کۆنگرە لە لایەن یەکێک لە ئەندام پەرلەمانەکانەوە پەیمانی ئەوە درا، ئەگەر ناوی کۆمەڵی ئیسلامیی بگۆڕدرێ بۆ کۆمەڵی دادگەریی، وەعدی چەند کورسییەک درا لەبۆ پەرلەمانی عێراق، دوای ئەم قسانە دەنگۆی ئەوە هەیە کۆمەڵی دادگەریی کە ناوەکەی گۆڕی، لەگەڵ بەشێک لەو پەرلەمانتارانەی هاوپەیمانێتیی هیوا بێنەوە نێو کۆمەڵی دادگەریی و هاوپەیمانییەک پێک بێنن، یاخود ببنە بەشێک لە کۆمەڵی دادگەریی، ئەوە تا چەند ڕاستە؟

**پرسیاری دووەم:** لەهەڵبژاردنی داهاتوودا، ئایا کۆمەڵی دادگەریی چۆن خۆی بۆ ئامادە کردوەو پێشبینیی چیە بۆ هەڵبژاردن؟

## مامۆستا عەلی باپیر:

**وەڵامی پرسیاری یەکەم:** ئێمە لەم هەڵبژاردنەدا هەموو ئەگەرەکانمان لەبەردەم دا کراوەن و، مافی خۆمانە لەگەڵ هەرکەسێ قسە بکەین و بەشێوەیەک لە شێوەکان پێکەوە تەنسیق بکەینو هاوکارو دەستبارگری یەکدیی بین، چ بە شێوەی حیزبێکی سیاسیی، چ بەشێوەی چەند کەسێک، بێگومان ئێمە کارمان لەسەر ئەوانە کردوەو کاری زیاتریش دەکەین، وەک گوتم ئێستاش کە ماوەکەی درێژکراوەتەوە، دەرفەتی باشترمان لەبەر دەستدا هەیە.

**وەڵامی پرسیاری دووەم:** کۆمەڵی دادگەریی لە قەدەر توانای باشی خۆ بۆ هەڵبژاردن ئامادە کردوەو، ئێستاش سەرگەرمی خۆ ئامادە کردنین.

## ٧. فەرمان صادق لە دیبلۆماتیک مەگەزین:

**پرسیاری یەکەم:** ئێوە ئاگاداربوون لە گەڕانەوەی مامۆستا سەڵاحەدین بۆ یەکگرتووی ئیسلامیی، هەوڵێک هەبوو ڕێکخستنەوەی لایەنە ئیسلامییەکان، ئایا گۆڕینی ناو لای کۆمەڵی ئیسلامیی کۆتایی بەو هەوڵە هێنا، کە لایەنە ئیسلامییەکان لە کوردستان بچنەوە یەک بەرە، کە ئەمە دەمێکە قسەی لەسەر دەکرێ؟

**پرسیاری دووەم:** لە کۆنگرەدا چوار ژن بە دەنگی خۆیان بوونەتە ئەندامی سەرکردایەتیی و، کۆمەڵ دەرگای کردۆتەوە بۆ ژنی لێهاتوو، سەرنجێک هەیە لەسەر بەڕێزتان و لەسەر کۆی ئەحزابی کوردیی، ئێمە بینیمان لە دوایی کە ڕەوان شاد نەوشیروان بزووتنەوەی گۆڕان تا ئێستا نەیتوانیوە ئەو جێگایە پڕ بکاتەوە، ئایا لەناو کۆمەڵی ئیسلامیی، دوای بیست ساڵ لە دروستبوونی سەرکردەیەک، قیادەیەک دروست نەبووە، بتوانێ جێگای مامۆستا عەلی باپیر بگرێتەوە، بۆیە ئێوە بە کۆی دەنگ هەڵدەبژێردرێنەوە؟

### مامۆستا عەلی باپیر:

**وەڵامی پرسیاری یەکەم:** ئەم ئەگەرە هەمیشە هەیەو ئێمە لەگەڵ یەکگرتووی ئیسلامییدا پەیوەندیی و برایەتییمان خۆش و پتەوەو بەدەم یەکەوەین و، ئەوە کە ئێمە گۆڕانکارییمان بەسەر ناوەکەماندا هێناوە، نەک ڕێگرنیە بەڵکو زەمینە خۆشکەریشە، من پێم وایە ئێمە هەمیشە پێویستیمان بە خۆ نێوکردنەوەو چاو بە خۆدا گێڕانەوە هەیەو، ئەوانەی خۆیان ناگۆڕن واقیعیان پێ ناگۆڕدرێ و، ئەوانەی ناتوانن دەستکاریی

هەنـدێ لـە بیـرو بۆچوونەکانی خۆیـان بکەن، بـۆ مامەڵە لەگـەڵ واقیعدا، بێگومـان هـەر لـە شـوێنی خۆیـان دەمێننـەوە، بـە حاڵەتێکـی دۆگمایـی و وەسـتاو، کەواتـە: ئـەوە نەخێـر هیـچ پـەرچ و ڕێگرنیـە، بەڵکـو زەمینـە خۆشکەریشـە، بـۆ زانیاریـی هەمـوو لایـەک: ئێمە لـە ڕابردووشـدا چەند جـار دەسپێشـخەرییان کـردوە بـۆ لای یەکگرتـووی ئیسـلامیی، کـە بـا یـەک بگریـن، بـەڵام دیـارە ئـەوان بۆیـان نەگونجـاوە، ئێسـتاش ئێمە هەر ئـەو قەناعەتەمـان هەیـە، کـە هێـزو وزەکان زیاتـر یەکبخەین، لـە هەموو لایەکـەوە، وەک گوتـم، چ لـە چوارچێـوەی کاری ئیسـلامییدا، چ فراوانتر بـۆ هەندێـک ئامانجـی دیکە.

**وەڵامـی پرسـیاری دووەم:** ئایـا کـەس نیـە لـە نێـو کۆمەڵـی دادگەرییدا شـوێنی بەنـدە بگرێتـەوە، دەڵێـم: بـا، لـە کۆنگـرەشدا زۆر داوام لەئەندامانـی کۆنگـرە کـرد، کـە یەکێکـی دی دابنێـن لـە شـوێنی بەنـدە، خەڵکـمان هەیـە بەڵگەشـم ئەوەیـە کـە ئێمـە پـازدە سـاڵ لەمەوپێـش، ئەوکاتـەی مـن نیزیکـەی دوو سـاڵ لـە لایـەن ئەمریـکاوە گیـرام، کۆمەڵـی ئیسـلامیی تـوانی کارەکانی خـۆی بەڕێوەبـەرێ و قیادەیەکـمان هەبـوو، دوایـی هەندێـک لـە بـرادەرانی بەرپرسـی ئـەم وڵاتـە گوتیـان: فـڵان کـەس! پیـاوت لـە دوای خـۆت بەجـێ هێشـتبوون و کارەکانیـان بەڕێـوە بـردوون! مـن پێـم وایـە دوای ئـەو پـازدە سـاڵە، ئێسـتا تواناکان زیاتریـش بـوون، بـەڵام ئـەوە قەناعـەتی خەڵکـە، بەڕاسـتیی منیـش پێمگوتـن بـە ئەندامانـی کۆنگـرە: خۆمتـان لەسـەر گـران ناکەم و ئێسـتا وە نەبـێ کاتێکـی زۆر فەڕەحنایـی بـێ، تەنگانەیـە بەنیسـبەت هەرێـم و عێـڕاق و ناوچەکـەوە، لەبـەر ئـەوە خۆمتـان لەسـەر گـران ناکـەم بڵێـم:

هەر نایکەم و مەرجتان لەسەر دابنێم، بەڵام پێم خۆشە یەکێکی دیکە دابنێن و، منیش هەر لەگەڵ کارو کاروانەکەم، بەڵام دیارە کە ئەوان قەناعەتیان وابوو بە یەکدەنگ بە پێویستیان زانیی لەم قۆناغەشدا بمێنمەوە، منیش بێ دڵیی ئەوانم نەکرد.

## ٨. ئامانج وەرتیی لە دیجیتاڵ میدیای زەمەن:

**پرســـیاری یەکەم:** کـــەی کورد یەکگرتـــوو دەبێ، لە هەمـــوو بۆنەو مەراســـیمێک دا حیزبە سیاســـییەکان، ســـەرۆکی حیزبەکان، هەموو لایەنە پەیوەندییـــدارەکانی حیزبیی و حکوومیـــی بەیاننامە دەردەکەن کـــە دەبێ کورد یەکگرتوو بـــێ، ڕوون و ڕەوان پێـــمان بڵێ: کەی کورد یەکگرتـــوو دەبێ؟ ئایا ســـەرۆکی یەکەمـــی حیزبە سیاســـییەکان لە هەرێمی کوردســـتان دا ، خۆیان هـــۆکاری ئەو نـــا یەکگرتووییە نین؟

**پرســـیاری دووەم:** ســـەبارەت بە هەوڵـــی داگیرکاریی لـــە هەرێمی کوردســـتان دا، لە لایەن دەوڵـــەتی تورکیاوە، بەتایبـــەت، بۆردومان و تۆپبارانـــەکان، هەڵوێســـتی بەڕێز مامۆســـتا عەلی باپیر لـــەو بارەوە چییە ؟

## مامۆستا عەلی باپیر:

**وەڵامـــی پرســـیاری یەکـــەم:** پێموایـــە کاتێـــک ئێمـــە دەتوانین یەکبگرین، وەک ئەو قســـەیەم کردوە لە (کەنەکە) کۆنگرەی نەتەوەیی کوردســـتاندا، کە دوو جار خۆم بەشـــدارییم کـــردوە و، دوو جاریش نوێنـــەرم ناردوە، ئێمە کاتێـــک دەتوانین ئەم نەتەوە ســـتەملێکراو و ستەم دیدەیە، لەســـەر نەخشەی سیاســـیی خۆمان یەک دەنگ و یەک ڕەنـــگ بکەین، کـــە خۆمان لە کـــوڵ و قەپێلکی بچـــووک بچووک بێینـــە دەرو، هەموومـــان بێینە نێو فەزای فراوانی نیشـــتمان پەروەریی و، هیـــچ کـــەس کەڵکەڵەی ئەوەی نەبـــێ کە دەبێ ئـــەوانی دیکە ژێر دەســـتی بن، کـــە بەداخەوە ئـــەم نەزعەیـــە هەیە، ئەگەر تەماشـــای

مێـــژووی کورد بکەین ئیمارا تەکانی بابان و ســـۆران و ئەردەڵان و بۆتان و، ئێســـتاش تەماشـــای واقیعی خۆمان بکەین، دەدەردی کوشـــندەمان خـــۆ خۆریی و ئەو خۆ پەســـەندییەیە، هەموو شـــت بەخـــۆ ڕەوا بینین و هیچ شـــتێک نەدان بـــەوانی دیکەیە، ئنجا ئەمە حاڵەتێکی گشـــتییە و دەبـــێ خۆمانی لێ دەربازبکەین، ئەوە نەخۆشـــییەکی کوشـــندەیە و، تاکو ئێمە وا نەکەیـــن عەقڵ و دڵی خۆمان فـــراوان بکەین و، مەرجمان نەبێ بۆ برایەتیـــی و تەبایی لەگەڵ یەکدیی دا، ئـــەوە نایەتە دی، وەک خوای پـــەروەردگار دەفەرمـــوێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ ١١﴾ الرعد.

واتە: خوا واقیعی هیچ کۆمەڵگایەک ناگۆڕێ، تاکو ئەوان خۆیان نەگۆڕن. دەبـــێ شـــێوەی بیرکردنەوەمـــان بگۆڕیـــن، دەبێ خولیاو هەســـت و نەســـتەکانمان بگۆڕین، ڕەوشـــت و ئاکارمـــان بگۆڕیـــن، ئنجا ئەوە تەفاســـیڵی زۆری هەیـــە و، لـــە کۆبوونـــەوەی تایبەت دا کـــە کراوە لەگـــەڵ لایەنە سیاســـیەکاندا لـــەو بارەوە قســـەی خۆمانـــم کردوە.

**وەڵامـــی پرســـیاری دووەم:** ئێمـــە پێـــمان وایـــە، وەک لـــە وتاری کۆنگرەشـــدا باسمکرد، بە نیســـبەت ئێران و تورکیاو ســـووریاو عێراق، ئەو ســـێ نەتەوەیـــە، نەتـــەوەی تورک و عـــەڕەب و فـــارس، دەبێ بەچاوی بـــرا تەماشـــای نەتەوەکەی دیکـــە بکەن کە هاوســـێیانەو، ئێمـــە ناتوانین کە ماڵەکانی خۆمان بگوازینەوەو کوردســـتان شـــوێنی کـــوردە، هەروەهـــا هی پێکهاتـــەکانی دیکـــەی کە لە کوردســـتاندا دەژیـــن وەک: عەڕەب و تورکـــمان و یەزیدیی و ئاشـــووریی، ئێمە تازە دراوســـێی یەکدیین و هـــەر دەبێ ســـیغەیەک بدۆزینەوە لەســـەری

پێکەوە مامەڵــە بکەین، باســمکرد کە کاتی خۆی لە پەیمانی شــومی ســایکس - بیکۆ لە ســاڵی: (١٩١٦)ز دا، ئــەم وڵاتەی ئێمــە لە نێو نیشــتمانی ئیســلامییدا دابەشــکرا، لە نێوان زل هێزەکاندا، دوایی لە پەیمانی ســیڤەردا (١٩٢٠)ز دا، لە برگــەکانی: (٦٢) و (٦٣) و (٦٤) بۆ کورد مافــی چارەنووس دانــدرا، بــەڵام دوایی لە پەیــمانی لۆزان لە ســاڵی: (١٩٢٣)زدا هەڵوەشــێندرایەوە، لەو کاتەوە ئەمــە ئەو حاڵەیە کە ئێمە بە دەســتیەوە دەناڵێنیــن، کەواتە: ئاگری چەوســێندرانەوەی کورد و دابەشــکرانی کوردســتان لە ریــشی زلهێزانەوە هەڵســاوە، بەڵام بەداخەوە میللەتە مســولمانە دراوسێکانیشــمان تەبەنییان کردوە، بۆیە مــن پێموایە، بە نیســبەت تورکیــاو ئێران و بە نیســبەت هەر وڵاتێکــەوە، دەبــێ بروایان بــە هێــزی لۆژیک بێ نــەک لۆژیکی هێز، دەبــێ ئامادەبن لەگەڵ کــورددا گفتوگۆ بکەن و دابنیشــن، دەبێ ئامادەبن ئــەو مافەی بە خۆیــانی رەوا دەبینن، بەوانیــشی رەوا ببینن، تۆ بۆ خــۆت دەوڵەتت هەیە لایــەنی کەم با ئێمــە هەرێمێکمان هەبێ، بــا ئۆتۆنۆمییەکــی راســتەقینەمان هەبــێ، ئەگەرنا ئەوە نــە واتای برایەتییە نە واتای پابەندییشــە بە رێکەوتننامــە نێودەوڵەتییەکانەوە، بەتایبــەتی ( جارنامــەی جیهانیی بــۆ مافەکانی مــرۆڤ )، بەڵام ئێمە پێش ئــەوەی گلەیــی لە عــەرب و فــارس و تورک بکەیــن، دەبێ گلەیی لــەو زلهێزانــە بکەین کە کاتی خــۆی ئەو وڵاتــەی ئێمەیان دابەشــکردوەو، ئێســتاش ئامادەنین چاوی پێــدا بگێرنەوە.

## ٩. ئەیوب وەرتی لە تۆڕی میدیایی ئێستا:

**پرســـیاری یەکەم:** بەشـێک لـە چاودێرانی سیاســیی و بەشـێک لە هاوڵاتییــان پێیان وایە، ئۆپۆزسـیۆن لــە هەرێمی کوردســتاندا پەرتەوازەیــە، چەنــد حیزبێکــی ئۆپۆزســیۆن هەیەو هــەر یەکەو بــە ئاڕاســتەیەک ئیــش دەکات، ئایــا بۆچــی تــا ئێســتا حیزبە ئۆپۆزســیۆنەکانی هەرێمی کوردســتان، یەکیان نەگرتــوە و، بە یەک ئاڕاســتەدا ئیــش ناکەن؟

**پرســـیاری دووەم:** لــە دوای گۆڕینــی پاشــگری ئیســلامیی بــۆ دادگەریی، خەڵکــی غەیرە ئیســـلام لەناو کۆمەڵی دادگەریی ئێســـتا جێــی دەبێتــەوە، دەتوانێ ببێتــە ئەندام لەنــاو کۆمەڵــی دادگەرییدا؟

## مامۆستا عەلی باپیر:

**وەڵامــی پرســـیاری یەکەم:** ئۆپۆزســـیۆن پڕژو بڵاوە، ڕاســـتە، بەڵام کۆمەڵێک هۆکاری هەن، هــۆکاری خودیی و هــۆکاری بابەتیی، ئێمە لەگەڵ ئەو لایەنە سیاســییانەدا کە پێکەوە ئۆپۆزســیۆن بووین قسەو باســمان زۆر کردوە، کە هەندێکیان ئێســتا ئۆپۆزســیۆن نەماون، بەڵام هەرکامێک لەوانــە ئەگەر لێی بکۆڵیەوە، بەلای منــەوە ڕەنگە هەڵەی کردبێ، بەڵام دەگونجێ پاســاو و بیانووی خۆیانیــان ببێ، بەڵام بەهەر حاڵ ئەوە واقیعێکە کە ئێســتا ئۆپۆزســیۆن ئــەو تۆکمەیی و خڕیی و پڕییەی نیە کە پێویســتە، بــەڵام ئێمە هەوڵ دەدەین خوا پشــتیوان بێ زیاتر ڕیزەکانی ئۆپۆزســیۆن یەکخبەینەوە، لەیەکیــان نزیکبخەینەوە، وەک گوتم پێوســتە ئێمە نەفەســی ئۆپۆزیســیۆنیش، نەفەسێکی

شـــەرعیی و نەفەســـێکی واقیعی بێ، ئێمە کاتی خۆی هەندێک کەس ئۆپۆزســـیۆن بوون، بەڵام بەو نەفەســـەی کە حکوومـــەت بڕووخێنن، ســـەقفی داواکارییـــەکانی خەڵکیان زۆر پێ هەڵابـــرد، دواییش لەگەڵ واقیعـــدا نەگونجـــا، ئێمە پێـــمان وایە کە دەبـــێ دڵســـۆزبین بۆ ئەم قەوارە سیاســـییەی خۆمـــان، ڕەخنە لـــە حکوومەت دەگریـــن، بەڵام نامانـــەوێ ناشـــیرینی بکەیـــن و بیڕووخێنین، بەڵکـــو دەمانەوێ کەم و کووڕییـــەکانی چارەســـەر بکەیـــن، حکوومەتیش دەبـــێ بەو چاوە تەماشـــامان بـــکات، بەداخەوە ئێمە لـــەم وڵاتەدا نـــە حکوومەت فێر بووە مامەڵەی ڕاســـت و دروســـت لەگـــەڵ ئۆپۆزســـیۆن دا بکات، نە ئۆپۆزســـینیش، هەڵبەتە بەگشـــتیی دەڵێم، کاتی خۆی دەمگوت: ئێمە دەبێ بـــە پێی ئـــەو ئایەتەی خوای پـــەروەردگار مامەڵـــە بکەین، کە دەفەرموێ:﴿وَإِذَا قُلْتُمْ فَٱعْدِلُوا۟ ﴿١٥٢﴾﴾الأنعام.

واتە: ئەگەر قسەتان کرد دادگەرانە قسە بکەن.

ئەگەر وەزیرێک شـــتێکی بـــاشی کرد، دەستخۆشـــیی لـــێ بکەین، دەیانگوت: نەخێر ئۆپۆزســـیۆن هـــەر دەبێ ڕەخنە بگـــرێ، دەمگوت: ئەدی ئەگەر شـــتی بـــاش کرا؟ ئەوە دەیانگوت: لە شـــتی باشـــیش دا نابێ دانی پێـــدا بێنین! کە مـــن پێموایە نەگونجاوەو بێ ئینســـافییەو لەگـــەڵ مەنتیقی قوڕئانـــدا تێک دەگیرێ، هەمیشـــە قوڕئانیش لەگەڵ زگماک و عەقڵی ســـەلیمدا دەگونجێ، وەزیرێک شـــتێکی باش دەکات یان بەڕێوەبەرێکی گشـــتیی شـــتێکی بـــاش دەکات، دەستخۆشـــیی لێدەکـــەم بۆ ئـــەوەی چوار کـــەس تەماشـــای ئەو بـــکات، خۆیشی لەســـەر ئەو چاکەی کـــە کردوویەتی زیاتـــر هاندراوبێ.

**وەڵامی پرسیاری دووەم:** ئێمە پەیڕەوی نێوخۆمان هەیە، پێش پێڕەوی نێوخۆش، ئێمە کاتی خۆی کە کۆمەڵی ئیسلامییمان بنیات نا (٢٥) خاڵمان نووسین، کە بەندە نووسیینی، ئەوانەی بینیوتانە، بینیوتانە، ئەگەر نا پێم خۆشە بیانبینن، ئێمە دوو جاران شەرحمان لەسەر کردوون، ئێمە بە پێی پێڕەوی نێوخۆ کەسێک کە پابەند نەبێ بە ئیسلام، ناتوانێ ببێتە ئەندام لەو کارو کاروانەدا، بەڵام ڕێی لێ نەگیراوە هەوادارو لایەنگرو دۆست و هاوکاربێ، ئێمە لەخزمەت هەموو لایەکداین، ئێمە نەک هەر ئافرەتێک کە سەرپۆش ناکاتە سەر، کە پێیان وایە ئافرەت پێویستە سەرپۆش بکاتە سەر، نەک هەر ئەو دەتوانێت دۆست و لایەنگری کۆمەڵ بێ، بەڵکو کەسێک کە ئەگەر خاوەنی گوناحی گەورەش بێ، دەتوانێ دۆست و لایەنگری ئێمە بێ، پێشمان خۆشە ئەوانە لێمان نیزیکبن، چونکە پێمان وایە ئەگەر لە لەم کۆمەڵ و کاروانە نیزیکبن بەهرەمەند دەبن و لە هەندێ خراپە دەیانگێڕینەوەو، بێگومان کاتی خۆیشی هەروا بووە، بەڵام ئێستا ئەوە زیاتر تۆخ دەکەینەوە، کە ئێمە وەک دۆست و هەوادارو لایەنگرو دەنگدەر لە خزمەت هەموو چین و توێژەکان و، هەموو پێکهاتەکانی کۆمەڵگای خۆماندایـن، بەڵام وەک ئەندام ، دیارە مەرجی ئەندامێتیی لە پێڕەوی نێوخۆو، لە (٢٥) بنەماکەماندا هاتوە.

## ١٠. ڕێبین مەجید لە کوردستان تیڤی:

**پرسیاری یەکەم:** بڕیار وایە هاوپەیمانیەتیەک بۆ ناوچەکانی دەرەوەی ئیدارەی هەرێم دروست بکرێ، ئەم هاوپەیمانییە گشتگیربێ و لایەنە سیاسییەکان بەیەکەوە بەشداربن، ئێوە وەک کۆمەڵی دادگەریی بەشدار دەبن؟

**پرسیاری دووەم:** ماوەی ڕابردوو گرووپێک هەوڵیاندا لە ڕێگای مووشەکەوە ئارامیی و تەبایی هەولێر تێکبدەن، ئێوە بۆچوونتان لەسەر ئەمە چیە؟

## مامۆستا عەلی باپیر:

**وەڵامی پرسیاری یەکەم:** بۆ هەر هاوپەیمانیەتییەک کە بە قازانجی خەڵکی هەرێمی کوردستان بشکێتەوەو، دواجاریش بە قازانجی خەڵکی عێراق بەگشتیی، ئێمە ئامادەین، بێگومان ئێمە ئەگەر پێکەوەبین لەوانەیە زیاتر بتوانین کورسیی دەستبەربکەین لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراقدا، کە زیاتر بەرگریی بکەن لە بەرژەوەندییەکانی خەڵکی هەرێمی کوردستان، بۆیە من لێرەوە ڕایدەگەیەنم: بەڵێ ئامادەین، بەڵام دیارە دەبێ قسەو باس بکرێ.

**وەڵامی پرسیاری دووەم:** ئەو سارۆخ بارانەی کە کرا، کە بە پێی زانیاریی کە بە من گەیشتوە، سارۆخەکان بە ئەمریکییەکانەوە نراون و، لە نیزیک فڕۆکەیەکی ئەمریکادا کەوتوون، ئەوەش کە کەوتۆتە نێو شاری هەولێر، ئەو سارۆخە دژە هەواییەی ئەمریکا بووە، کە گرتوویەتە سارۆخەکان بۆ ئەوەی نەکەون و، لێرە کەوتوە، بێگومان

ئێمە هەموو جۆرە شێواندنێکی بارودۆخی چ هەرێمی کوردستان، چ هەر پارێزگایەکی دیکەی عێراق، چ هەر شوێنێکی دیکەی دنیا، لە لای ئێمە مەڕفوزە، ئەوەش شتێکی خراپە کراوەو، ئەمریکا خۆی بە خاوەنی قەزیەکە دەزانێ، بیستیشتان دوێنێ و پێرێ هەندێک کاردانەوەی بووە، ئنجا من نازانم بینا لەسەر چی و، تا چ ڕاددەیەک بۆی ساغ بۆتەوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئێمە هەر جۆرە شێواندنێکی هێمنیی و ئاسایشی ئێرەو، هەر شوێنێکی دیکە ڕەفز دەکەین، ئەوە شتێکی ناحەقەو پێویستیشە خەڵکی هەرێمی کوردستان، هەموو لایەنە سیاسییەکان، یەک دەنگبین لەبەرانبەر پاراستنی هێمنیی و ئاسایشی ئەم وڵاتەدا کە بێگومان هەموومان لە هێمنیی و ئاسایش بەهرەمەندین و، هەمووشمان لە ئاژاوەو ئاشووب زەرەر مەندین.

## ١١.هێرش قادر لە (NRT):

**پرسیاری یەکەم:** دەگوترێ: ئەگەر کۆمەڵی دادگەریی لە حکوومەت دا بەشداربووایە "بەتایبەتی ئەم قسەیە لە نێوان پارتیی و یەکێتیدا دەکرێت" ئەگەر پۆستەکان پێیان بدایە، ئەو دەنگەو ئەو نارازییەی ئێستایان نەدەبوو، بەڵکو وەک حیزبەکانی دیکە کە ئێستا لە حکوومەتدان بێدەنگ دەبن؟

**پرسیاری دووەم:** هەر یەکێتیی و پارتیی دەڵێن: خوا کۆمەڵی حیزبی ئۆپۆزسیۆنی باشی بە ئێمە داوە، پەرلەمانە دەریدەکەین، کادیرە دەیگرین، کاتێک باسی هاوپەیمانیەتیی دەکەین لەگەڵماندا یەک دەگرن؟

## مامۆستا عەلی باپیر:

**وەڵامی پرسیاری یەکەم:** من هەموولایەك دڵنیا دەکەمەوە کە کۆمەڵی دادگەریی کۆمەڵێک مەبدەئو پرەنسیپی هەن کە لە قورئان و سوننەت و شەریعەتەوە هەڵیهێنجاون، یەکێک لەوانە ئەوەیە کە دەبێ ئەم وڵاتە دادەگەریی تێدابێ، دەبێ قۆرخکاریی و گەندەڵیی و خۆسەپاندنی تێدا کۆتایی پێ بێ، ئێمە کاتی خۆی لەگەڵ ئەو بەرانبەرانەدا کە داوایان لێ دەکردین بەشداربین گوتوومانە: ئێمە مەرجمان هەیەو، مەرجەکانی ئێمەیش لە ڕاستییدا وەک مەرجی هەندێک لایەن نەبوون، کە بە مەرجیشی بگرین و دوایی پێوەیان پابەند نەبین، ئێمە نەک هەر لە کابینەی ئەم جارەدا کە بەشدار نەبووین، ئێمە لە کابینەکەی پێشێ دا کە بە دوو و سێ

وەزیر بەشـــداربووین، لـــە ڕەخنەگرتنی خۆمان نەوەســـتاوین، یەکێک لـــەو ڕەخنانـــەی حوکمڕانان لە ئێمەیـــان دەگرت، دەیانگـــوت: ئێوە لە حکوومەتـــدان و ڕەخنـــەش دەگرن، ئێمـــەش دەمانگـــوت: ئێمە بەو مەرجە لـــە حکوومەتدا نەبووین دەمی خۆمان ببەســـتین، گەندەڵیی و قۆرخکاریـــی و نـــا دادگەریی و ســـتەم هەیە، لـــە ڕووی ئەمنییەوە چەوســـاندنەوە هەیە، چۆن بێدەنـــگ بین؟ من هیچ کاتێـــک بە ڕەوای نازانم لـــە حکوومەتێکدا بەشـــداربی، بەمەرجی قەرەقـــەپ لێکردن و خۆ کردن بە کەڕەی شـــەربەت لەمـــاف و ئازادییـــەکانی خەڵک!

**وەڵامی پرســـیاری دووەم:** ئەمە دوو ڕووی هـــەن، لەو ڕووەوە کە تۆ پشـــتگیریی زوڵم وســـتەم بکەی، بێگومان خراپە، بـــەڵام دەڵێم: ئێمە بۆ هـــەر هاوپەیمانیەتییەک کە بەقازانجی خەڵکی هەرێمی کوردســـتان بشـــکێتەوە، ئامادەین، لەگەڵ لایەنە حوکمڕانەکانیشـــدا دەبێ شتێکمان هەر هەبێ، لـــە وڵاتێکداین، ئەگـــەر لە بەغـــدا نوێنەرایەتییەکی باش بکرێ بـــە قازانجی هەمـــوو لایەکمانـــە، ئەوانەش کـــە پەرلەمانتاری ئێمە دەردەکـــەن، با هەمـــوو لایەک دڵنیابـــن، هەم شـــەڕەف و ڕێزو حورمەتە بـــۆ پەرلەمانتارەکەمـــان و هەم بۆ حیزبەکـــەش، ئەوەش کە دەری دەکات خۆی دەخاتە ژێر نیشـــانەی پرســـیارەوە و پێشی ناشیرین دەبـــێ، کەواتە: ئێمـــە زەرەرمـــان نەکردوە لـــەو ســـەودایە دا، ئێمە شـــانازیی بە پەرلەمانتارێکمانەوە دەکەین لەســـەر ئـــەوەی حەق دەڵێ، هیچیـــان پێ ناکرێ، ئـــەوە نەبێ کـــە دەری بکەن، لە جیـــاتی ئەوەی گوێی لێ بگرن و پێشـــنیارەکانی وەربگرن و لێی بەهرەمەندبن، باشـــە ئـــەم وڵاتەی ئێمـــە کـــەم و کووڕیی کـــەم تێدایە؟ زوڵم و ســـتەم و

گەندەڵیی کەم تێدایە؟ دەکرێ تۆ هەرکەسێ ڕەخنەی لێ گرتی و شتێکی لەسەر نووسیت، سزای بدەی؟! خۆ هەر سۆران عومەر نیە، ئەوە خەڵکی دیکەشەو، ئەوە ڕۆژنامە نووسەو نووسەرەو ڕاگەیاندنکارە، هەرکەسێ ڕەخنەی گرت و هەرکەسێ تێبینییەکی خستە ڕوو بەدڵت نەبوو، بە جۆرێک مامەڵەی لەگەڵدا بکەی و بە چاوی دوژمن تەماشای بکەی؟ بێگومان ئەوە شتێکی هەڵەیەو سەرەتای فەشەل هێنانە.

## ١٢.ئاکار فارس لە کەناڵی سپێدە:

**پرسیاری یەکەم:** سەبارەت بە لادانی پاشگری ئیسلامیی، حەزدەکەم لە زاری جەنابتەوە ڕوونکردنەوەیەکم گوێ لێ بێ، هەم بۆ دۆستانتان، هەم بۆ نەیارانتان، ئەوانەی پێشتر کۆمەڵی ئیسلامییان ناسیوە، ئێستا لە دوای لادانی ئەو پاشگرە ئیسلامییە کۆمەڵی ئیسلامیەکی تر دەناسن، یان هەر کۆمەڵی ئیسلامییەکەی جارانە؟

**پرسیاری دووەم:** سەبارەت بە ئۆپۆزسیۆن بوون، باست لەوە کرد کە ئێمە ئۆپۆزسیۆنین، بەڵام نامانەوێ ئەم حکوومەتە بڕووخێ، بەڵام باوەڕتان بەوە هەیە کە ئەگەر ئەو حکوومەتە نەڕووخێ بەڕاسپاردەو پێشنیارەکانی ئێوە چاکسازیی دەکات، واتە: باوەڕتان بەوە هەیە ئەم حکوومەتە چاکسازیی ئەنجام بدات؟

## مامۆستا عەلی باپیر:

**وەڵامی پرسیاری یەکەم:** ئێمە کۆمەڵی دادگەریی وەک نێوەڕۆک و جەوهەری هەر وەک خۆیەتی، ئێمە گۆڕانکارییمان کردوە لە شێوەی مامەڵەمان لەگەڵ واقیعدا، لە فۆڕم و دیکۆردا، بەڵام لە جەوهەرو نێوەڕۆکدا بێگومان ئێمە هەر پابەندین بە قورئان و سوننەت و شەریعەت و بەو بنەما شەرعییانەی کە کاتی خۆی ئەم کارو کاروانەمان لەسەر بنیات ناون، بەڵام ئەمە بەو واتایە نیە کە ئێمە هەر لە یەک کەوڵدا دروا بین و چاو بە هیچ شتێکی خۆماندا نەگێڕینەوە، ئێمە بەردەوام لە چاو بەخۆدا گێڕانەوەداین، ئەگەر بەرهەمەکانی بەندەتان خوێندبێتەوە، لە زۆر ڕووەوە کتێبم نووسیوە، مەوسووعەی: (ئیسلام و دەوڵەتداریی) کە چوار بەرگە،

(خوا پەرستیی ئیسلامیی) کە چوار بەرگە، (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی) لەشەش بەرگدا، لە ڕووی هونەرو ئەدەب و لە ڕووی یادو بۆنەکان و لەزۆر ڕووەوە، هەمیشە خۆم زیاتر تێدەفکرم، تەماشا دەکەم، لێدەکۆڵمەوە، جاری وا هەیە دەگەمە ڕایەک کە پێشتر ڕایەکم هەڵبژاردوە، ئێستا ئەو ڕایەم پێ بەهێزترە، ئێمە هەمیشە لە چاو بەخۆدا گێڕانەوەدا دەبین، بەڵام وەک گوتم جەوهەرو نێوەڕۆکی کۆمەڵی ئسلامیی، بێگومان پارێزراوەو ئەو پارێزراوییەش بەو واتایە نیە کە حاڵەتێکی دۆگماییمان وەرگرتوە.

**وەڵامی پرسیاری دووەم:** ئەوە کە ئۆپۆزسیۆنین و نامانەوێ حکوومەت بڕووخێنین، بۆیە وا دەڵێم، چونکە ئۆپۆزسیۆنەکانی دنیا هەموویان ڕەخنە دەگرن لە حکوومەت، بەڵام بەچاوی دوژمن تەماشای ناکەن، مەبەستم پێی ئەوەیە، بەڵام ئەگەر حکوومەتێک فەشەل بێنێ و نەتوانێت لە ئاستی داخوازیی و چاوەڕوانیی خەڵک و کۆمەڵگادابێ، بێگومان ئەرکی ئۆپۆزسینە بڵێ: تۆ لاچۆ، ئەو ئەمانەتە تەسلیمی خەڵکێکی دیکە بکە، بەڵام ئەوە کە لەو ڕووەوە نا، کە ئێمە دوژمنایەتیی حکوومەت دەکەین، بەڵکو لەو ڕووەوە کە ئێمە دۆست و دڵسۆزی خەڵک و وڵاتەکەین و، حکوومەتیش دەبێ خزمەتکاری خەڵک بێ، ئاخر حکوومەت دەبێ لە یەک ئاستدا لەبەرانبەر هاووڵاتییان بوەستێ و، دەبێ لەسەر بناغەی مرۆڤ بوون و هاووڵاتیی بوون مامەڵە لەگەڵ خەڵکدا بکات، نەک لەسەر بناغەی ئینتیمای حیزبیی، ئەگەر وا نەبێت ئەو کاتە بەڵێ ئەرکی ئۆپۆزسیۆنە بڵێ: تۆ لاچۆ و ئەو ئەمانەتە تەسلیمی کەسانی دیکە بکە، یاخود هەڵبژاردنی پێش وەخت بکرێ، یان بە هەر میکانیزمێك کە بگونجێ، ئەو حکوومەتە بگۆڕرێ.

## ١٣.هۆشمەند سادق لە (K24):

**پرســـیاری یەکەم:** ســـەبارەت بـــە تێڕوانینی کۆمەڵـــی دادگەریی بۆ مافە نەتەوایەتییەکانی کوردســـتان چیـــە، دوای کۆنگرە؟

**پرســـیاری دووەم:** ســـەبارەت بە ئەو (لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ)یـــە دوای کۆنگرە، دوای ناوە ئیســـلامییەکەتان لابـــرد، ئـــەو (لَا إِلَـــهَ إِلَّا اللهُ)یە ئەوەش لادەبەن، لەســـەر ئاڵایەکە؟

**پرســـیاری ســـێیەم:** چەقـــی ڕەخنەکانتـــان بـــۆ تەنیـــا لـــە هەولێـــرە لەشـــوێنکانی دیکـــە نیـــە؟

## مامۆستا عەلی باپیر:

**وەڵامی پرسیاری یەکەم:** ئێمە لە وتاری سیاسـیی کۆنگرەدا باسـمان کرد، کە ئەم نەتەوەیەی ئێمە لەسـەر نەخشـەی سیاسیی سـڕاوەتەوە، بەڵام بە دەسیسـەو پیلانی زلهێزان، پەیمانی سـایکس بیکۆ لە نێوان فەڕەنساو بەریتانیاو ڕووسیادا مۆرکـرا، دواتـر ئەمریکاو زلهێـزەکانی دیکەیش هەموویان تەبەنییـان کرد، ئێمە دەبێ ئەو ڕاستییە بزانین، کە پێمانەوە دراوە، لە لایەنی زلهێزانەوە پێمانەوە دراوە، بەڵام دوایی میللەتانی دراوسێش ئەوەیان تەبەننیی کردوە، ئێمە لەگەڵ ئەوەداین کـە نەتـەوەی کورد کە ئێسـتا بـەلای کەمـەوە چل ملیۆن کـەس دەبـێ، ئەگەر زیاتریـش نەبـێ، کـە بەپێـی ڕای شـارەزایان، گەورەتریـن نەتەوەیە لە دنیـادا لە مـافی ڕەوای خۆی بێبەش کـراوە، خوا پەروەردگار کـە دەفەرموێ:﴿وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا ۚ﴿١٣﴾﴾ الحجرات.

واتـە: کردوومانـن بـە چەنـد گەلێـک و، چەنـد تیرەیـەک تاکو پێک ئاشـنابن، پێکـەوە هاوکاربن.

کەواتـە: چەنـدە عـەرەب و تـورک و فـارس نەتـەوەن، ئەوەنـدەش کـورد نەتەوەیـە و، هـەر مافێـک ئـەوان هەیانـە، ئێمـەش هەمانـە، بـەڵام کـە لە مافەکانمـان بـێ بـەش کراویـن، پێویسـتە ئـەو مافانـەی خۆمـان بزانین و بەدواشـیاندا بچیـن و هەوڵیـش بدەیـن بـۆ دەسـتەبەرکردنیان.

**وەڵامی پرسـیاری دووەم:** لە کۆمیسـۆنی باڵای هەڵبژاردنەکان لە بەغدا، بـەر لەوەی خۆمان قسـەی لێ بکەیـن، لەوێوە هەم ناوی کەسـی یەکەمی حیـزب، گوتوویانـە: ئێمـە لەگەڵ نـاوی (ئەمیـر)دا مامەڵـە ناکەین، نەک ئێسـتا، چەنـد سـاڵێک لەمـەو پێشـیش، گوتوویانـە: (رئیـس الحـزب) بـێ، یـان هەرناویکـی دیکـە، بەنسـبەت ئاڵاشـەوە گوتوویانـە: نابـێ هیچ وشـەیەک لـە هیچ لایەنێکی سیاسـییەوە بـەکار بهێنرێت کـە موزایەدەی دینداریـی تێدابـێ، لەبـەر ئەوە ئێمـە ئاڵاکەمان ڕەنگەکـەی دەهێڵینەوە بۆ ئـەوەی لەگەڵ ئەو یاسـایەی کۆمسـیۆنی باڵادا تێـک نەگیرێین، لەجیاتی وشـەی تەوحیـد ، ڕەمـزو هێمایـەک دادەنێین کـە هەمان مانـا بگەیەنێ.

**وەڵامـی پرسـیاری سـێیەم:** ئەوەیـان لەگـەڵ ڕێـزم دا بـە بۆچـوونی جەنابـت، وا نیـە، بـەڵام زوڵـم لەکـوێ زیاتربـێ، ڕەخنـە بـۆ ئـەوێ زیاتـر دەچـێ، ئەگەرنـا نەخێـر ئێمە لـە ڕووی خۆشـیاندا بە یەکێتی نیشـانییان گوتـوە و بـە قیـادەی پارتییشـیان گوتـوەو، ئێسـتا کـە گۆڕانیـش لەنێـو حکوومەتدایـە، بەوانیشـیان گوتـوە، پێیـان دەڵێیـن: ئەم وڵاتـە هی هەموو لایەکـە، هـی چەنـد کەسـێک نیـە، هـی کەمینەیەکـی ملیاردلێـر نیـە، لەسـەر حیسـابی زۆرینەیەکـی ڕەش و ڕووت حوکمڕانیـی بـکات، بـەڵام کـێ دەسـەڵاتی زیاترەو کـێ قەرەباڵغی زیاتـری هەیە، بە هـەر هۆکارێک بـێ، ئـەو قەرەباڵغییـە کە دروسـت بـووەو، کێ زیاتـر بەنـاوی هەرێمەوە

حوكـم دەكات و، كـێ زیاتـر واریـداتی ئـەم وڵاتـەی بەدەسـتە، بێگومـان ڕەخنـەكان زیاتـر ڕوو لـەو دەكـەن، ئەگـەرنـا ، نەخێـر ئێمـە زۆر جـار گوتوومانـەو، یەكێتـی نیشـتمانیی لەو بارەوە گلەییشـییان لـێ كردووین، گوتوویانـە: ئایـا هـەروەک یەكیـن؟! گوتوومانـە: لـە هێندێـک ڕووەوە وەک یەكـن، پێكـەوە ئـەم وڵاتەتـان ئیـدارە داوە، لەمـاوەی سـی (٣٠) سـاڵی ڕابـردوودا، بـەڵام بێگومـان یەكێتـی نیشـتمانیی كراوەتـرە و ئـەوە خاڵێكـە بـۆی حیسـاب دەكـرێ، لە هێنـدێ شـتدا یەكێتی چـاوی بەخۆیدا گێڕاوەتـەوە بـۆی حیسـاب دەكـرێ، هەروەهـا ئەگـەر لـە شـتێكی دیكەدا پارتیـی باشـتر بـێ، بـۆی حیسـاب دەكـرێ، بـەڵام بێگومـان هەردووكیان بەرپرسـیارن لەبەرانبـەر ئـەم دۆخـەدا، كـە ئێسـتا ئـەم هەرێمەمـان پێـی گەیشـتوە، بـۆ وێنـە: لـە مامەڵەیـان لەگـەڵ بەغـدادا، كـە ئێسـتا ئێمـە تـووشی چـەق بەسـت بوویـن لەگـەڵ بەغـداداو، ئومێـدم وایە ئـەو چەق بەسـتنە زوو كۆتایـی پـێ بـێ و، چـی دی خەڵكـی هەرێمـی كوردسـتان بـە چـوار مانـگ جـارێ مووچەیـەک وەرنەگـرن! و بەردەوامیـش بـاج و گومـرگ لـە سـەریان زیاد بـكات!!

# وتاری کۆنگرەی یەکەم

# کارو پڕۆژەی ئیسلامییمان

ئـەم نامیلکەیـە لـەو دوو وتاری مامۆسـتا عەلی باپیـر پێکهاتوە کە لە سـەرەتاو کۆتایی یەکەمین کۆنگرەی (کۆمەڵی ئیسـلامیی)دا پێشکەشی ئەندامانـی کۆنگـرەی کـرد، کە لـە ڕۆژانـی: ( ٩ و ١٠ و ١١ ) مانگی ( ١١ ) سـاڵی ( ٢٠٠٥ ) کـە لەشـاری سـلێمانیی بەسـترا ، لەو میانەدا مامۆسـتا عەلـی باپیر هەوڵیداوە سـەرجەم دیـدو بۆچونو ڕێڕوونییو ئاڕاسـتەکانی خـۆی -کە بـۆ قۆناغو هـەلو مەرجـی ئەوسـای کارو پڕۆژەی ئیسـلامیی پێویسـت بوون لە سـێ تـەوەرەی سـەرەکیی خرایە ڕوو.

**ئەم نامیلکەیە لەو تەوەرو بەشانەی خوارەوە پێکهاتوە:**

**وتاری سەرەتای کۆنگرە:**

## تەوەری یەکەم
## ئاوڕدانەوەیەك لە ڕابردوو

١. ڕەگ و ڕیشـەی مێژوویی مان .
٢. هەل و مەرجی سەرهەڵدان و ئیعلان کردنی کۆمەڵی ئیسلامیی
٣. بناغەی کاری کۆمەڵی ئیسـلامیی.
٤. ئەو ئاسـتەنگ وگرفتـانەی هـاتنە ڕێی کۆمەڵی ئیسلامیی .
٥. کۆمەڵی ئیسلامیی و بەشداری کردنی لە هەڵبژاردن دا
٦. کۆمەڵی ئیسلامیی پاش ڕزگابوونی بەندە لە زیندانی ئەمریکا .
٧. لەسەر ڕاستە هێڵ مانەوەی کۆمەڵی ئیسـلامیی .

## تەوەری دووەم

## سـەرنجدانی واقیعی ئێسـتامان

١. مەسـەلەی ڕەشنووسی دەسـتووری عێراق .

٢. مەسـەلەی ڕەشنووسی دەسـتووری کوردستان.

٣. داگیرکرانی عێراق لە لایەن ئەمریکاوە.

٤. چارەسەری کێشە و ئاڵۆزییەکانی نێوخۆی عێراق .

٥. کێشـە و ئاژاوەی نێوان شـیعە و سـوننـە .

٦. واقیعی کوردسـتان .

## تەوەری سـێیەم

## لە داهاتودا چی بکەین و چۆن بکەین ؟!

١. چەند بنەمایەکی گرنگی کاری ئیسلامیی .

٢. شـێوازی کار.

٣. پێداویسـتییەکانی کاری ئیسـلامیی .

**یەکەم:** لە نێوان خۆمان و خوادا، ئاگان لە ئیمان و تەقوا بێت .

**دووەم:** لە نێوان خۆمان دا، برایەتیی و دۆستایەتیی بپارێزین.

**سـێیەم:** تێڕوانینمان بۆ ژیانی دنیا، جێی تێدا تاقیکرانەوەیە.

**چوارەم:** لە ئیش و کارەکانمان دا، دەبێ ڕاوێژ بناغەی نەگۆڕ بێ .

**پێنجەم:** لەگەڵ کۆمەڵگادا: پەروەردەکردنی کۆمەڵێکی پێشەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی

## وتاری پێش کۆتایی پێهێنانی کۆنگرە

١. شەهیدانی سەر بەرزمان و بنەماڵە کەس وکاری سەربەرز و بەڕێزتان .

٢. برایانی پێشمەرگە و موجاهید .

٣. ڕێکخستنەکانمان.

٤. دەربارەی زیندانییەکانمان.

٥. مووچەی نوێنەرانمان لە پارلەمان و ئەنجوومەنی پارێزگاکان

٦. بەشداریی کردن لە لیستی هاوپەیمانی کوردستان دا.

٧. کاروچالاکی مان لە هەندەران .

٨. دەڤەری بادینان .

٩. شاری کەرکووک .

١٠.هەڵەبجە و هەورامان و شارەزوور و پشدەر .

١١.دام دەزگا حکوومەییەکان

١٢.لیژنەی ئامادەکاری کۆنگرە و سەرجەم لیژنەکان و ئامادەبووان.

شوێنی نووسین: هەولێر

بڵاوکردنەوەی: لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی ئەمیر/٢

ساڵی چاپ: (٢٠٠٦)

قەبارەی کتێب: (١٧+٢٤)

ژمارەی لاپەڕە: (١١٠)

لەبەڕێوەبەرایەتیی گشـــتیی کتێبخانە گشتییەکان / هەرێمی کوردســـتان ژمارەی سپاردنی (٥٣٥) ی ساڵی (٢٠٠٦)ی پێدراوە





PDF


ڤیدیۆ


https://archive.org/download/alibapir2018_gmail_1_20180212_2108/Binder1.pdf


https//:youtu.be/GtUfz9tXTpc?list=PL6HuvNeXiFwtybK9r6VSAdCuFJnMvCOPl

## وتاری کۆنگرەی دووەم

# ڕاپۆرتی: ئیمانیی، فیکریی، سیاسیی کۆمەڵی ئیســـلامیی کوردســـتان

ئـەم نامیلکەیـە دەقـی وتارێکـە کـە مامۆسـتا عەلـی باپیـر لـە کۆنگـرەی دووەمــی کۆمەڵــی ئیســلامیی دا لــە ڕۆژانــی: (٣٠و٥/٣١و ٢٠١٥/٦/١)دا بەســترا، وەك ڕاپۆرتێکـی ئیمانیـیو سیاسـییو فیکریـی بەنـاوی مەکتەبی سیاسـییەوە پێشکەشـی کـرد.

### ئەم نامیلەکەیە لەچوار تەوەری سەرەکیی پێکهاتوە:

**تەوەری یەکەم:** تەوەرەیەکی ئیمانییە، لەژێر ناوونیشانی: (بیـرخستنەوەو ئامۆژگاریی)دا

**تــەوەری دووەم:** تــەوەری سیاســیی: لەژێــر ناوونیشــانی: (ئەرکــی ســـەرشانمانو هەڵوێســـتو هێڵــە گشـــتییەکانمان)دا

**تەوەری سـێیەم:** چەند هەڵوەستەیەکی فیکـریی

**تەوەری چـوارەم**و کۆتایی (باسـی کۆنگرە)

شوێنی نووسین: هەولێر

ساڵی چاپ: (٢٠١٠)

قەبارەی کتێب: (١٢+١٥)

ژمارەی لاپەڕە: (٨٠)

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٢٣٧٨) ساڵی (٢٠١٠)ی پێ دراوە








• PDF •

• ڤیدیۆ •


https://archive.org/details/111111_20200321/mode/2up


https//:youtu.be/iqi8FB63K6Y?list=PL6HuvNeXiFwuVG_ZckDqYKW7Wg6rSrb6C

# وتاری کۆنگرەی سێیەم

# وتاری فیکریی و سیاسیی کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامیی

ئــەوەم نامیلکەیــە دەقــی وتارێکــە کــە مامۆســتا عەلــی باپیــر، لــە کۆنگــرەی ســێیەمی کۆمەڵــی ئیســلامییدا پێشــکەشی کــرد، کــە لــە ڕۆژانــی: (٣٠و٥/٣١و ٢٠١٥/٦/١)دا لەشــاری هەولێــر بەســترا.

**ئەم نامیلکەیە لەسێ تەوەری سەرەکیی پێکهاتوە:**

## تەوەری یەکەم
## بۆچوون‌و هەڵوێستەکانمان

١. بەنســبەت گۆڕانکارییەکانــی نێوخــۆی عێــڕاق‌و ســووریاو، هەڵتۆقینــی (داعــش)ەوە.
٢. بەنسبەت هەرێم‌و عێڕاقەوە.
٣. بەنسبەت وڵاتانی دراوسێوە.
٤. بەنسبەت دەوڵەتی کوردستانەوە، لەباشووری کوردستاندا.
٥. چاکسازیی لەهەرێمی کوردستاندا.
٦. پەیوەندییەکانمان.
٧. پەیامێك بۆ پێشمەرگەو ئاسایش‌و پۆلیس.
٨. پتەوکردنی ڕیزەکانمان.

## تەوەری دووەم
## نێوخۆی کۆمەڵی ئیسلامیی

١. ئامانجمان.
٢. بنەماکانی کارمان.
٣. کاتی خۆی بۆچی ئۆپۆزسیۆن بووین و چۆن ئۆپۆزسیۆن بووین؟.
٤. دەستخۆشیی‌و سوپاس‌و پێزانین.
٥. کاری خوشکان.
٦. قوتابیی‌و گەنج‌و لاوەکانمان.
٧. بانگەوازو پەروەردە.
٨. تەبایی‌و یەکڕیزیی نێوخۆمان.
٩. گۆڕانکاریی‌و چاکسازیی، بەردەوام پێویستە.
١٠. چۆنیەتی بەڕێوەبردنی کارەکانی کۆنگرە.

## تەوەرەی سێیەم

١. پەیوەندیی لەگەڵ خوادا: کە لە (تقوی)دا بەرجەستە دەبێ.
٢. پەیوەندیی نێوان خۆمان.
٣. پەیوەندیمان لەگەڵ خەڵک دا.

شوێنی نووسین: هەولێر

بڵاوکردنەوەی: لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی ئەمیر/٦

ساڵی چاپ: (٢٠١٦)

قەبارەی کتێب: (١٥+٢٠)

ژمارەی لاپەڕە: (٥٢)

لەبەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٤٥٩)ی ساڵی (٢٠١٦)ی پێدراوە





PDF


ڤیدیۆ


https://archive.org/details/20200321_20200321_2149/page/n1/mode/2up


https//:www.youtube.com/playlist?list=PL6HuvNeXiFwtybK9r6VSAdCuFJnMvCOPl

# نێوەڕۆک

**کۆنگرەی چوارەم** ویستگەیەکی گرنگ بۆ چاو بەخۆدا گێڕانەوە لە ڕابردووداو، ڕوانین بەرەو داهاتوو، لە ڕابردوودا هەر کەم و کووڕیی و کرچ و کاڵییەکمان بووە بتوانین چارەسەری بکەین خوا پشتیوانبێ و، هەر چاکەیەکمان بووە بتوانین زیاتر بیچەسپینین و، گەشەی پێ بدەین، بۆ داهاتووش دوورو فراوان بڕوانین، فراوانتر لەوەی کە هەین و باشتر کار بکەین باشتر لەوەی کە تاکو ئیستا کردوومانە.